حکومەتا هەرێما کوردستانێ – عیراق
وەزارەتا پەروەردێ
رێڤەبەریا گشتی یا پرۆگرام و چاپەمەنییا

# دەستپێکێن فەلسەفێ

## بۆ پۆلا یازدێ ئامادەیی وێژەیی

دانان

د. حسام الألوسي — د. إحسان محمد حسن
د. علي حسين الجابري — د. قيس النوري
أ.د. عبدالأمير الأعسم — خالد الجباري
د. فاتنة حمدي جميل — جميل أبراهيم الحبيب

هاتییە کرمانجیکرن ژ لایێ

قيس صباح حميد
كروان مصطفى مصطفى — لشكر حاجي محمد طاهر

پێداچوونا زمانی — پێداچوونا زانستی
محمد عبدالله أحمد — لشكر حاجي محمد طاهر

چاپا سێیێ　۲۷۱۵ کوردی　۲۰۱۵ زایینی　۱٤۳٦ مشەختی

# پشکا ئێکێ

# فەلسەفە و ڕامانێن وێ

تشتەکێ بساناهی نینە، ڤەکۆلەر بشێت هزرەکا تەمام دەربارەی ناساندن ودیارکرنا فەلسەفێ ب کورتی و ب هویری و سەرتا سەری، وەك ناساندنا هندەك زانیاریان و زانستێن دی، بدەتە دەست و لسەر باخڤیت، چونکی رامانا فەلسەفێ هێدی هێدی مل بملێ گۆهۆرینێن دیرۆکی و زانیاری ومرۆڤاتی و فەلسەفی دگۆهۆڕینێدایە.

فەلسەفە پەیڤەکا (تێگەهەکێ) یۆنانییە ژ هەردوو پەیڤێن ((فیلۆ)) و ((سۆفیا) پێکهاتیە. ((فیلو)) ب رامانا خۆشتڤیاتیێ و حەز و ئارەزووبوونێ دهێت و ((سۆفیا)) ژی ب رامانا زانست و زانا بوونێ دگەهینن. ئانکو دشێین بێژین: (فەلسەفە، چالاکییەکا بەرنامەرێژە خەباتێ دکەت ژ ڕاستییا زانیاریان و (راستیان) ودیاردێن جۆرا و جۆر تێبگەهیت وەکی گەردۆن ومرۆڤ وهەڤبەندییێن دناڤبەرا واندا وفەلسەفە خەباتێ دکەت بۆ هندێ دابرامانا گەردوونی و ژیانێ بگەهیت و شرۆڤەکرنێ لسەر هەڤبەندییا مرۆڤی بگەردوونێ ڤە بکەت وشیانا مرۆڤی دەربارەی زانینا گەردوونی وهەلسەنگاندنا وی بکەت وهەروەسا ژڕوویێ ئەرکێن مرۆڤی ومفایێن وی هەمبەر وی ب خۆ و ئەو جڤاکێ کو ئەو ب خۆ وخەلکێ دی تێدا دژین.

فەلسەفێ دڤێت ب ئاشکرایی سنوورێ ئەوان تشتان دیاربکەت کو بابەتێ ڤەکۆلینێن وێنە، دڤێت ناساندن و ناسنامێن پڕ چارچوڤە بۆ دابنیت، هەتا ئەو راددێ کو دشیاندابیت فەلسەفێ بهندێ دەستنیشان بکەت کو (زانستێ ناساندنا یە)، یان بۆ نموونە ئەگەر مامۆستایێ زانستێ، پویتە ب ناساندنا وی زانستی نەدەت، ودیارکرنا رامانا گەلەك ژ وان پەیڤێن کو بکاردئینیت نەکەت وەکی: (ماددە)، (لڤین)، (یاسا)....هتد ئەڤە ژهندێ نەهاتییە کو پشتگوه هاڤێتنە، بەلکو ژ هندێ یە کو ئەڤ ئەرکە بۆ فەیلەسۆفان بجه دهێلێت. ئەڤجا ژبەرکو تشتێن

فەیلەسۆفی کو بابەتێن ڤەکۆلینێ نە، بەهرا پتر هەستپێکری و دەستگرتی نینن، بەلکو پێکهاتینە ژ هزرو تیگەهـ و، بەرچاڤکرنا رەپ و روویت، نموونە: (فەیلەسۆف ل جهێ کو بەحسێ مرۆڤەکی، یان کەسەکێ تایبەتی بکەت، دێ هێت بەحسێ تێگەهێن هەمی مرۆڤان کەت کو ئەو ژی (مرۆڤاتییە) هەروەسا لجهێ کو بەحسێ رەنگێ تەباشیرێ بکەت، یان بەحسێ دیوارێ گێچێ بکەت، دێ بگشتی بەحسێ (سپیاتی) کەت ئەڤجا ژبەر کو کێشە بڤی رەنگی هاتنە گۆڕێ، ژبەر هندێ هەر ژ دەستپێکێ نابیت چاڤەرێبوونا روون و ئاشکرییێ لێ بکەین، ژ ناساندن و ڤەکۆلینێن فەیلەسۆفاندا، ئەڤە ژلایەکیڤە، ژلایەکێدیڤە، ژبەرکو فەیلەسۆف دڤی کاریدا، پشت ب وان هزرو بۆچوونێن بەراهیێ ڤەگرێددەت، دڤێت، چاڤەرێ ئەو ێژی بینن کو جوداهی و هەڤرکی دناساندن و ڤەکۆلینێن واندا هەبیت، ژبەر ڤێ راستییان (گوتییە) کو: بتنێ فەلسەفەیەك نینە، بەلکو فەلسەفەیێن زۆر و جوداهەنە، ب رێبازێن جۆرا و جۆر و ئاراستە جودا..... دبیت هندی هژمارا فەیلەسۆفان فەلسەفێن جودا هەبن، ئانکو د بیاڤەکێ وەسادا، رێککەفتن لسەر پێناسەکا سەرتاسەری بۆ فەلسەفێ کارەکێ بساناهی نینە، بەلکو گەلەکێ ب زەحمەتە، بتنێ ئەوێ دگەهینیت کو فەلسەفە شیانا ناساندنێ نینە، **ژبەر هندێ دبێژن (فەلسەفە هەولدانەکا (پێکۆلەکا) چاك و مرۆڤانەیە، بۆ پشکنین وڤەکولین و سەربۆڕیێن وێ، نەکو زاراڤەك بیت بۆ ناساندنێ).**

ئەڤە دگەل ناساندنێن کەڤن و نوی وهەڤچەرخدانا تەباینە، وەکی ئەوا وەسا هاتیە نیاسین کو فەلسەفە گەریایە لدویف راستیان، یان زانابوون دل پەروەرییە و... کو ژڤان بابەتانە، کو ژ نهۆ و وێڤە دێ روون کەین.

ژبەر هندێ، دشیاندایە بهێتە گوتن کو فەلسەفە ب خۆ ب خۆ نینە، بەلکو فەلسەفە یا هەی، ئەڤەژی بۆ هندێ یە د ئاستەنگ و گرفتێن ناساندنا وێ هویربین

بین، هەروەسا چونکی فەلسەفە کریارەکە، یان چالاکییەکە، هەردەم ژی ناساندنا چالاکیێن وێ ب ئەرکترو ئالوزتر ژ ناسناما تشتەکێ یارکری.

**پۆختەیا (کاکلکا) ناساندنێ:**

**(فەلسەفە): (چالاکیەکا هزری و هوشیارانەیە، کو خەلك ب رێیا وێ کریار و پێکولا هندێ دکەت دسروشتێ خۆ و گەردۆنی بگەهن و هەڤبەندیێن دناڤبەرا گەردوونی و مرۆڤی ڕوون بکەن).**

## جوداهی دناڤبەرا فەلسەفەکارییا ئاسایی و یا پۆخت (ڕێکوپێك):

مەزانی کو فەلسەفەکاری چالاکییەکا گشتیا مرۆڤانەیە، بەلێ چەند ئاستەنگ هەنە، ئاستێ فەلسەفە کارییا ئاسایی، یان ئاستێ سادە یان نەتایبەتمەند، یان نەرێکوپێك، ئەڤەژی ئەو ئاستن کو لدەف زارۆکی دەردکەڤیت، هەروەسا ژ (پەند، لاوك) و ئاخفتنێن باب و باپیراندا و ل داستانێن دێریندا و هەلبەست و هونەریدا بگشتی دەردکەڤیت. ئاستێ (فەلسەفەکاری) یا پوخت و فەیلەسوفانژی بدرێژاهییا دیرۆکێ هاتییە زانین... ئەڤەژی گرنگترین جوداهێن دناڤبەرا هەردوو ئاستێن فەلسەفەکاریێ نە:

### أ- کێشا زمانی (مسالة اللغة):

د دەمەکیدا مرۆڤەکێ ئاسایی بزمانەکێ سادە فەلسەفەیەکا ئاسایی دەردبریت، کو زمانێ ئاخفتنا ڕۆژانەیە، فەیلەسوف برێکا زاراڤێن هونەری و هویر و پوخت هزروبیرێن خۆ دادرێژن، کو دڤێت فێرببین، کا چاوا فێری زاراڤێن تایبەتمەندێن هەر زانستەکی دبین... د هەمان دەمدا ژی ئەو زاراڤێن هونەری، دبنە مەزنترین ئاستەنگێن تێنەگەهشتنێ دناڤبەرا پرانیا فەیلەسۆفان و خەلکێ ئاساییدا، بەلێ دگەل فێربوونا زاراڤێن هونەری و خواندنا بەردەوامدا، ئەڤ ئاستەنگە هێدی

هێدی دێ ڕابن و نامینن. زاراڤ دهەر زانستەکیدا دگرنگن، بجهێلان و دەست ژێبەردانا وان یا بزحمەتە، ژبەر کو هندی هویری و چڕی تێدا هەنە، هەر زاراڤەك جهێ ڕستەیەکا تماما ئاخفتنا ئاسایی دگریت.

### ب- هزر (بیر)

ئەو هزرو بیرێن کو دفەلسەفێن سادەدا هەین ڕێکو پێکیاوان تێدا بدەستڤە ناهێت، دێ بینین دهزرو بیرێن فەلسەفێن شەهرەزایاندا یا روون و ئاشکرایە. فەلسەفە دهزرکرنا ئاساییدا، فەلسەفەیەکا نەتەمام ولسەر دەمێ یان دشێوێ دەسپێکیدا دژیت، بەلێ هزرکرن د فەلسەفێن ڕێکو پێکدا ئەندامەکێ تەمام و موکوم و سیستەمەکێ ڕوون و ئاشکرا هەیە.

### ج- کێشا ڕێکخستن و گونجاندنێ:

ئەو هزرو بۆچوونێن دئاستێ سادە یان ئاسایی دا، ڕێکو پێکی و کورتی و گونجاندن تێدا نینە، بەلێ دسیستەمێ فەلسەفا شەهرزاییانە وتایبەتمەندا بشێوەکێ گشتی گونجاندن و تەبایی و پێکڤە گرێدانەکا بهێز تێدا دبینین، ئەڤ جۆرە ڕێبازا فەلسەفی بنیاتەکێ موکوم هەیە.

### د- پرچاندن و بەردەوامی یا وی:

(فەلسەفە کارییا) ئاسایی، یا ڤەدو پەدو خۆرستی (خۆزایی)، بەلێ فەلسەفەکاری هەر وەکی کا چاوا ئەم چ کەسەکی ب (شویشەچی، یان هەر ناڤەکێ دی ناڤ ناکەین، بتنێ ئەو نەبیت کو بدرێژیا ژیانا خۆ موژیلێ کارێ دروستکرنا شویشان بیت، هەروەسا ژی سەرەدەمییێ دگەل (فەلسەفەکارییێ)دا دکەین، ئەگەر ب هویری پەیڤا فەیلەسۆف بکاربینین، هەردەم نابێژینە وی کەسی (فەیلەسۆف) کو جارو باران بەرێخو ددەتە تشتان وهزرتێدا دکەت - دپشکنین یان گۆمانێ پێ دبەت، ئەڤجا بۆچوونا خۆ بەرامبەر دەردبڕیت و ئێدی دێ گرێدایێ بۆچوونێ بیت، بەلکو دبێژنە

وی کەسی فەیلەسۆف کو ب درێژیا ژیێ موژیلێ ئەڤی کارییە و وەلێ کریە کو ببیتە گرنگترین مەرەم وئارمانجێن ژیاناوی، ب هویری دچیتە رِه و رِیشالێن تشتان، دگەل وان زانیاریێن بەری نهۆ ئەم پێ گەهشتین و ئەوێن دناڤ وی بابەتیدا پێ گەهشتین و مێشکێ وی موژیل کری.

## ه- رِۆهنیا هوشیاری و شێلیاتیا وێ:

هەروەکی چاوا لبەراهیێ هاتیە رۆهنکرن، دێ بینن مرۆڤ د پێنگاڤێن ئێکی یێن ژیانا ویدا و، دژیانا ئاساییدا، گەلەك شێوە وهوشیاریێن جودا جودا تێدا هەبووینە، هونەرو وزانست و ئەفسانە، بیرو باوەر و تشتێن دی، بەری کو هوشیاریا رێکو پێك تێدا دەربکەڤیت، دوی سەردەمیدا زانستەکێ سەربخۆ و تایبەت ب جڤاکی ڤە نەبوویە، یان سروشت، یان هێشتا وەکو مرۆڤ نەبوویە ونەکەفتییە بەرچاف. هەروەسا هەست وپێزانینێن کۆمەلایەتی یێن کەسی، هەروەکی یێن جڤاکی بوون، یان هەر وەکی یێن عەشیرەتێ بوون، ئانکو ئێکبوون. ژبەر هندێ هەست و هزرێن وان وەکی ئێکبوون، هەروەسا کریارو جوانی و جوانکاریا وانژی وەکی ئێکبوون.

د پێنگاڤا هزرکرنا رێکو پێکدا (منظم)، کو لدویف پێنگاڤا ئێکێدا دهێت ئەڤ هەست و تێگەهشتنە ژ رِوویێ ناڤەرۆك و رۆخسارێڤە هاتینە گوهۆرین، ودەزگەه و رِێکخراو هاتنە گۆرێ، وەکی هەر چالاکییەکا ئارمانجا وێ رازیکرنا حەزو ئارەزوویەکێ هەبیت، ئەو چالاکییەکا کریاریە، لوی دەمی گەریان و ڤەکولین بدویف تێگەهشتنێ، یان زانیاریان، ژحەزا ئاگەه لێبوونێ سەرهلددەت وبکاریگەر ترین حەزو ئارەزووی دهێتە زانین ژوان حەزو ئارەزوویێن کو دمرۆڤیدا دبنە جهێن. لەورا هەر رامانەك ئەڤانە دکەتە هەول و بزاڤەکا کریاری. ئەڤەژی وێ دگەهینیت، کو دڤێت بەرسڤا پرسیارێن وێ دەستگرتی بن.

## پێدڤیێن فەلسەفی

د وان هەمی تشتێن هاتینە گوتن، مە هەلسەنگاندن و ئەم لێ ڤەکۆلین، دشێین ب کورتی هۆکار و پێدڤیێن فەلسەفەکاریێ دئەڤان خالێن خوارێدا کۆمبکەین:

### ١- ڕامان و مەندەهۆشی (التأمل و الدهشة ):

گرنگترین سالوخەتێن مرۆڤی دگەل خرڤەبوون و جڤاکبوونا ویدا، ئەوە، کو مرۆڤ گیاندارەکێ ئێکانەیە، کو دەربارەی هەبوونا خۆ و تشتێن دەردۆرێن وی پرس و بۆچوون هەبن، دەمێ مرۆڤ بۆ جارا ئێکێ هەست دکەت، ب جۆرەکی هەبوونا خۆ دسەلمینیت کو پێدڤی ب لێکدا نەڤێ نەبیت، بەلێ گەلەك ناڤەکێشیت، چونکی پاشی دێ پرسیاردکەت (پرسیارکرن دایکا فەلسەفێیە)، پرسی مرۆڤی مەندەهۆش دکەت، ئەڤجا بنەجھ دکەت، ئێدی چەند ئاستێ هزرکرنێ یێ نزمبیت، پرسیار بەرەڤ نهێنیبوونێ کێمتردبن، بەلێ چەند هۆشمەندییا مروڤی روهن و فرەھ بیت، دێ ئەو کێشە بەلاڤتر و مەزنترلێهێت و، ل وی دەمی ڕامان و مەندەهۆشییا وی دێ بیتە هزرەکا خەمگین و پشتی هنگی دێ رژدیێ لسەر زانینا ئەگەران وراڤەکرنا وان کەت.

### ٢- گۆمان و ئەزموونا زانیاریێ:

د ڕاستیدا گۆمانکرن ژ ئەنجامێ هزرکرنێ یە، یان تایبەتمەندییەکا ژبیرییا مرۆڤییە، دەمێ زانیاریێن سەرا ب تێنا تێهنیاتیێ هەست پێنەکرن ب تاما ئاڤێ لدەمێ لەرزوتا مرۆڤی دگریت، دیتنا ڕۆژی وەکی تەپەکێ، نەدیتنا چەند ڕەنگەکان ژ لایێ شەڤ کویرانڤە، دیتنا پێنڤیسەکی بشێوێ خوار یان شکەستی دناڤ ئاڤێدا ...هتد)، ژ ڤێ چەندێ گۆمان لدەڤ مرۆڤی پەیدادبیت، ژبەرکو وەسا هەست دکەت کو ژیری و هش وبیرێن مرۆڤی د دژوارییێدانە، (ئەڤەژی نیشانێن دیارن، هزر و بۆچوون و بریار و بیرو باوەرێن جودا جودا لگۆڕێنە، هەتا ئەوی ڕادەی کو دانا

بريارێن جودا لسەر ئێك تشت هەیە ژلایێ گەلەك كەسانڤە). هەروەسا لدەڤ مرۆڤی وەسایە، ئەو زانیاریێن خەلكی برێكا زاراڤەكرنێ پەیداكرین، پشت ب سەلماندنا خۆ بدەستڤە بەردانێ گرێددەت، كود بیت یا بێ بنیات بیت، ئەڤجا گۆمان د هزرو مێشكێ ویدا دئازریت، پاشی دێ هەوڵدەت بدویڤ زانیاریێن راست دویر ژ گومانێ بگەریێت.

### ٣- ترسی ژكارێ نەهاتیە دیتن:

پشكەكا زۆر ژوان كارێن ڕووی ب ڕوویێ مە دبن، كو مرۆڤی پێ ئاڵۆز و شەپرزە دبیت، وەك: مەرگ و مرن و نەخۆشی و دەردو ئێش و خەبات د ژیانێدا، خۆ چەماندن و سەرنەچەماندن بۆ رێكەفت و هۆكارێن نەدیار و تشتێن دی، ئەڤە هەمی ژێدەرەكن ژ ژێدەرێن رەسەنێن فەلسەفەكاریێ).

### ٤- بئێك گەهشتن و دانوستاندنا بەرەبابان:

ب ئێككگەهشتن و هەڤبەندیكرن دگەل كەسێن دیدا، گرنگترین هۆكارن، ئێك ژ فەیلەسوفێن نوی دوێ باوەرێدایە بهایێ فەلسەفێ یێ گرێدایە ب هەڤبەندیكرنا خەلكی بئێك و دووڤە ... بەلێ فەلسەفە یا هەی پێكۆلا هندێ دكەت بگەهیتە خەلكێ دی و خۆ بدەتە نیاسین و دەربكەڤیت خەلكی گۆل وی ببیت، ژبەركو مرۆڤ ب ئێككگەهشتن وتێكەلبوونێ دگەهیتە هیڤی و ئومێدو مەرەمێن فەلسەفێ لداویێ هەست ب هەمی ئومێدێن دی دكەت ژ ئێكگەهشتن و ئارامبوونێ.

## بیاڤێن فەلسەفێ و ئارمانجێن وێ بدرێژیا چەرخان:

ئارمانج ژ ئینانا ئەڤێ بابەتی بتنێ بۆ هندێیە، ژ ئارمانجێن سەرەكیێن دیرۆكا درێژا فەلسەفی بگەهین، هەتا كو ئەوی وێنێ فەلسەفێ تمام بكەین كو هەتا نهۆ ئەم موژیلی ڕوونكرنا وی بووین، ب بابەت و بەرنامە و نیاسینا گیرو گرفتێن

ویڤە. ئارمانجا فەلسەفا کەڤن (هند و چین و دۆلا هەردو رویباران و مسرا کەڤن) ئارمانجەکا کریاری و ژیانێ بوویە. لدۆر مرۆڤی و رەوشت و چارەنڤیسێن وی دزڤریت و دەربارەی کێشا مرن و نەمریێ و رزگاربوون ژ لەشی، یان ژ دەرد وئێشێت داویێ. بەلێ دگەل فەلسەفا یونانیدا، بگرە ژ (ئەرستوتالیس) وەرە، هەتا دگەهیتە ڤوتابخانێن سروشتی یێن بەری (سۆکرات)ی، ئارمانجا فەلسەفێ وبابەتێن وێ یێن هەرە مەزن پێکهاتیبوون ژ: بەحس و ڤەکۆلینا جیهانا سروشتیا دەوروبەرێن مرۆڤی، بنەمایێ یان بنەرەتییا تشتان؟ ئەرێ هەمی دبنەڕەتدا، ئێك توخم بوون، یان زێدەتر؟ ئەرێ دێ چاوا ژ ئێك توخمی وزێدە توخمییا تشتان تێگەهین؟ فەلسەفە و زانست لدەف وان ئێك تشت بوون . . . ئەو هەم زانا بوون و هەم فەیلەسۆف بوون. بەلێ ئەڤ پویتە دانە ب جیهانا دەرڤە، هاتە گوهۆرین بەرەڤ پویتەدانێ ب مرۆڤی و رەوشتێ مرۆڤی و هەڤبەندیێن وی ب خەلکەکێ دیڤە، ئەڤە ژی لسەر دەستێ سۆفستاییان وسۆکراتی ب ئەنجام گەهشت و لسەر دەستێ ئەفلاتۆنی وفەیلەسۆفێن نوی و هەڤچەرخێن وی، بەحسی و بابەت دەربارەی گەردوونی و مرۆڤی وجڤاکی و سیاسەتی و هونەری گەهشتە راددێ کاملبوونێ وبیاڤێن فەلسەفێ (چ هەیی لپشت سروشتی) و (میتا فیزیك) و (زانستی لوژیك - المنطق) و (فەلسەفا هونەری)، یان (زانستێ جوانکاریێ) و (فەلسەفا رەوشتی) و (فەلسەفێن زانستی) و (هزرو بۆچوون - بیروباوەر ) هاتنە گۆرێ. فەلسەفا نویژی رویکرە ڤەکۆلینا مرۆڤی (کەسایەتیا دوور هێلی - واقعي) نەك گشتی، هەروەسا فەلسەفە کاریژی هاتە گرێدان ب کارکرن و گوهۆڕینێ، ب ڕامانەکا دی، هزر (بیر) بکارکرنێ ڤە هاتە گرێدان . . . ئەڤە کلیلا پشکا هەرە زۆرا ڕۆخسارێن فەلسەفیێن هەڤچەرخن، کو دپێدڤینە ژ بۆ ئاڤاکرنا جڤاکەکێ پیشکەفتی د جیهانێدا.

## پرسیارێن بەشێ ئێکێ

پ ١/ گرنگیا فەلسەفێ ڕوون بکە؟

پ ٢/ جوداهێن دناڤبەرا فەلسەفا ئاسایی و فەلسەفا پوخت (ڕێکو پێك) چنە؟

پ ٣/ پەیڤا (فەلسەفە) ژ چ وەرگێرایە و رامانا وێ چ دگەهینیت؟

پ ٤/ ئەرێ ئەم دشێین بێژین: فەلسەفە شیاندانا دادپەروەرییێیە؟ د ئەڤێ ڕستێدا چییێ کێمە؟

پ ٥/ خەباتێ بکە پێنج هزرێن سەرەکی ژ ناساندنێن جودا جودا روونبکە، کو هەمیان پێکڤە کومبکەت.

پ ٦/ دانوستاندنەکێ لسەر هەمی ناساندنێن جودا جودا یێن فەلسەفێ ئەنجامبدە.

پ ٧/ پێدڤیێن هزرکرنا فەلسەفی چنە؟

پ ٨/ ئارمانجا گشتی یا فەلسەفێ وئارمانجا تایبەتییا وێ لسەردەمێ یۆنانیان و موسلمانان وسەردەمێ نوی روونبکە؟

پ ٩/ هندەك وێنا لسەر بجهئینانا کریارا فەلسەفێ بینەدەر.

## پشكا دووێ

# جۆرێن هزركرنێ

دشێین جۆرێن هزركرنێ، ب ڤی شێوەی دابەش بكەین:

١- هزركرنا ئەفسانەییا كەڤن (داستانی).

٢- هزركرنا ئایینیانە.

٣- هزركرنا زانستییانە.

٤- هزركرنا فەلسەفییانە.

ئەم دڤێرەدا ئێكسەر دێ دەست ب دیاركرنا تایبەتمەندیێن هەرچوار شێوازێن هزركرنێ كەین كو بڤی جۆرێ خوارێ نە:

## ئێك: هزركرنا ئەفسانەییا كەڤن ( داستانی ):

دڤێت بكورتی لسەر ڤی شێوازێ هزركرنێ باخڤین، چونكی ئەڤە قوناغەكا دیرۆكیا گەلەكا دویر درێژ ڤەدگریت لچاڤ قوناغێن دی. بتایبەتی ژی هزركرنا فەلسەفی و زانستیانە، ژبەر كو هێشتا گەلەك ژ ئامرازو تایبەتمەندیان د جڤاكێ مەدا چەندین جڤاكێن دیێن جیهانێدا بجۆرەكی ژ جوران هەنە ودهێنە دیتن ئەڤ تایبەتمەندییە ژی ئەڤەنە:

### ١- نزمییا ئاستێ هزركرنێ:

مرۆڤێ بەراهیێ پشت ب هەستێن خۆ گرێددان و هزرو بۆچوونێن وی ژ ڤی سنوری دەربازنەدبوون، بەلێ ئاشۆپێ خۆ گەلەك ب بەرفرەهی بكاردئینا، مرۆڤی دڤێرەدا (بتایبەتی دقوناغێن دەسپێكیێن ئێكێدا) ژیر (هزر) وكەرستە ژێك جودا نەكرینە، هەروەسا گیاندارو بێ گیانان ژی جوداهیا خۆ نەبوو لدەف وی، بەلێ ئەڤ تشتە هەمی د ئاستەكێ زۆردا ژ ئێكۆدو دنێزیكبوون.

گەلەك ژ وێ نێزیكتربوو كو ئەم دزانین، لدەف وی وەسا بوو جۆرەكێ هەڤبەندیا ڤەشارتی دناڤبەرا واندا ئەو كربوونە ئێك، مرۆڤێ بەراهیێ بشێوەكێ شەپرزە و بێسەرو هوشیاریا هندەك هەڤبەندییێن ئەگەری (السببیة) دكر، (ئانكو كار ل ئێكۆدوكرنا تشتان) ئەڤە ڤەدگەراندن بۆ هێزێن نەدیار وەكی: گیان (روح) و (ئەهریمەن)، بەلێ ئەو دیاردە و ئافرەندییێن سروشتی یێن هەیی لدەف هزرا مرۆڤێ بەراهیێ وەسا ددیار بوون كوب تشتێن نهێنی و نەدیار (غیبي) تێكەلیئێك دبوون، هەردەمێ ئەو توشی دیاردەكا تایبەت بخۆڤە ببان (لایەنێ دەروونی) یان روویدابا، وەك: خەون دیتن، یان تایبەتی ب تشتێن دەوروبەرێن ویڤە، وەك لەهی، باران، دەرد، كولب وخەلا، ئێكسەر پەنا دبرە بەر هێزەكا نەدیار، خۆ ژێ دپاراست و قوربانی پێشكێشی وی دكرن، ئێدی كا چاوا ئەم دیاردان و تشتان دبەینە سەر ئەوی سروشتێ مە باوەری پێ هەی، ب ڤی شێوەی هێدی هێدی هێزا كارتیكرن و پەسەندیا وی و فەرمانڕەواییا وی دداهێزین نەدیار: بتنێ دەمێ كو دبینی مرۆڤ دسەرمادا رەق دبیت، وەسا دانا كو سەرما پێكهاتییە ژ ڕوویەكی بتنێ، یان لایەنەكێ سێرو سێربەندیێ، یان گیانێن خراب.

## ٢- زێندیبوونا مادەی (بوونەوەر):

ئەڤە دو رامانان ددەت **ئێك**: ئەوە كو سەرەدەرییا مرۆڤێ بەراهیێ دگەل ئافراندنییێن ماددی وەك زندی هاتینە دانان، ئانكو تشتەك نینە یێ زێندی بیت وتشتەكێ دی زێندی نەبیت، روونتر بێژین ئەگەر بەر لدەف وان یێ زێندی بیت، وێ ناگەهینیت كو گیانێ تێدا، بەلكو بەر دناڤخۆدا یێ زێندییە. یا **دووێ** ژی ئەوە: هەر تشتەكێ هەیی، هەمی گیاندارن، گیان یێ تێدا، د ڤێ قوناغێدا -كو لدویڤ دەم

و سەردەمی لدویف قوناغا ئێکێدا دهێت - ژیان یان زیندیا گیانی (رۆح) دیار دکەت. ئانکو گیانێ هەبوویەکی ولەشێ ویێ زێندی، یان بیێ ژێ جودایە. لڤێرە دسپێکا جوداکرنا لەشێ زێندی پەیدابوو کو جوداکرنا ماددی وگیانی یە. ئەگەر کەڤرەك (بەرەك گرێلبوو، ئەڤە وێ دگەهینیت گیانەکێ تێدا و گرێلکریە، د ڤێرەدا ئەو دەردکەڤیت کا مرۆڤی چاوا بۆچوونێن خۆ یێن جودا جودا و خواست و سەربەستیی و بزاڤێن خۆ لسەر هەمی تشتان سەپاندییە، هەتا ئەوی رادەی ئەگەر بەرەکی پیێ وی بریندارکر، دێ سزادەت.

هزرکرنا ئەفسانەیانە لسەر هندێ یا هاتییە دامەزراندن کو دیاردێن سروشتییێن نەزێندی ب ڕەنگێ زێندی ڕەنگ بکەت، ب جۆرەکی هەروەکی تشت ب تێکڕایی گیاندارێن زندی بن، وەکی مرۆڤی هەست ب تشتا بکەن و کەرب و سوز و ڤیان لدەڤ هەبیت.

## دوو: هزرکرنا ئایینیانە:

د ڤێرەدا مەرەما مە ئەو نینە بەحسێ لایەنێن هویرو تایبەتی و گرۆڤێن باوەرییێن ئەڤان ئاینان ویێن دی بکەین، هەروەسا مە نەڤێت ژی بشێوەکێ تیۆری شرۆڤەکرنا بیردۆزێن هویرو هەمی لایەنی بۆ سەرهلدان و دیرۆکا ئایینان بکەین، ئەوا دڤێرەدا مەرەم پیێ، روونکرنا راستییا هزرکرنا ئاینییانەیە دگەل گرنگترین نیشانا مورکێن تایبەتییێن ویدا کو ژشێوازێن هزرکرنا ئەفسانەیی و فەلسەفیانە و زانستیانەدا دهێتە جوداکرن.

د ڤێ بەحسی دا (نزیکی) فەلسەفا ئایینی - یان ئەوا ب (لاهوت)ی هاتییە ناڤکرن، نابینن یان ئەو بیاڤێ کو بشێوەکێ گشتی مەرەم ژ فەلسەفا ئایینی بیت، یان فەلسەفا لاهۆتی، یان کرستیانی (مەسیحی) وئیسلامی بیت، یان هەر ئایینەکێ دیارکرییێ دی بیت.

بەری دیارکرن و خستنەروویا تایبەتمەندییێن هزرکرنا ئایینی، نەچارین گەلەك ب کورتی، ئاماژە بۆ جووتە لێکدانەڤەیا مەزن ژ سەرهلدانا ئاییندارییێ ڕابکێشین، **یا ئێکێ: لێکدانەڤەیا دیرۆکی یا هۆشمەندانە (مرۆڤانە). یا دوویێ: لێکدانەڤەیا ئایینیانە (یەزدانییانە).**

### ١- لێکدانەڤەیا هوشمەندانە یا پوخت (مرۆڤانە)

ئەڤە گروف و باوەرنامێن خۆ ژ ڤەکۆلینێن جۆدا و جۆرێن کۆمەلآیەتی وەردگریت. کو دەربارەیێ بیرو باوەرێن ئایینی یێن وان گەلانن کۆ هێشتا ل چارچوڤێ جڤاکێ سەرەتایی دانە. هەروەسا ئەڤ لێکدانەڤە پشت ب هندەك ژ شونوواران وب هێلێن گشتی دهێتە گرێدان (دڤێرێدا ل بیردۆزێن جۆرا و جۆر دگەرێین).

وەکو بەری هینگێ مە روون کری ل سەر بەحسێ زیندییا (حیویە) ماددە و گەردوونی. مرۆڤێ سەرەتایی پشتی تشت ژ ژیانێ جودا کری کۆ ئەڤا تێدا وتشتێن خۆ داینە دگەل گیان وهێزێن ڤەشارتی بڤێ مەترسییەکا دی ئێخستە سەر مەترسیێن دیتر ل سروشتی، ئەو ژی مەترسییە ژ ئافراندیێن نەهێنە دیتن، ئێدی هندی ب سەرهاتی وهەر ژ رویدای هەمی دانە پال وان هێزان، چ پەنا و رێك بۆ نەما بوون ژبلی هندێ کو ب بەسێربەندییێ و فال و قوربانیان وان رازی بکەت . . . ئەڤە گشت دیاردێن بەراهیێن ئایینی بوون.

ژبەر هندێ کۆ مروڤێ بەراهییێ دناڤ داراستانان دا موژیلێ نێچیرێ بوو، مەترسییا گیانەوەرێن دڕندە نەچارکر دەست ب پەرستنا گیانەوەران و ڕووەکی بکەت، ئەڤجا **ئایینێ تەوتەمی** Toteism سەرهلدا، تەوتەمی کرە هێمایێ هوزا خۆ بۆ باوەری ب پیروزیا وی وبڤێ ژی ب هێزا ژ رادی دەرکەفتی (الخارقة) پێ بەرچاڤ دکر: کۆ هزرا (خوداوەند) یان ب (هێزا مەزن) دهاتە دیارکرن هەر وەکو

بەری هینگێ ژی مە دزانی ژڤی تەو تەمیێ تێگەهێن جۆرا وجۆرا یێن حەرامکرن و قەدەغەکرنێ و نەپەسەندیێ وپیرۆزیان هاتنە گۆرێ کۆ ب (تاپۆ) دناڤدکرن ئەڤەژی ڕووخسارەکێ کۆمەلایەتی یێ هەر ئایینەکی یە.

دەمێ مرۆڤ ل نێچیرێ بەرەڤ چاندنێ چووی، ئێکەمین ئاستەنگ د ڕێیا ویدا پەیداکرنا دەخل و دانی بوو یان بەرهەمەکێ چاندنێ یێ باش بوو، ئێدی لڤێرێ کێشاپیت وبەرەکەتێ حەزا وی بوو وفەر بوو پەنایێ ببتە بەر سیرمەندیێ و قوربانیا وپێشکیشێ ئەردی بکەت هەتا رازی بکەت وپێشکیشێ ستێران و ئەختەران دکربۆ ڕاکێشانا سۆزا وان چونکی وەسا دانا بوو کۆ ئەڤە بونەوەرێن گیانینە و مەلبەندێ بریسیان وبارانێنە وژێدەرێ بایێ و روناهییێنە، هەر ئەختەرەك ببو خوداوەندەکێ تایبەت وبڤی جۆرێ (ئەختەر پەرستی) سەرهلدا، هەر ئەختەرەکی خوداوەندەکێ بسپۆرو وتایبەتمەندییا دیاردەکێ بوو، ئەڤە خوداوەندێ بارانێ بوو ویێ دیتر خوداوەندێ پیت و بەرەکەتێ بوو . . . . هتد.

ژێدەرێ ترس و لەرزینا مرۆڤێ بەراهییێ هەر گیانەوەرو وکاودانێن سروشتی نەبوون، بەلکو ئەو ژی بوو کو هەردەم دگەل دابوو، وخەونێن ویژی بوو ب تایبەتی ئەو خەونێن ب مریان ڤە ددیتن ئەڤجا (مری پەرستی) یێ سەرهلدا ل میسرێ و ڕۆما و مەکسیکێ و پیرۆ پاشا وەکو خودێ دپەرست هەتا پشتی مری ژی.

### ٢- ئایین یێ خودێیە ل ڕێیا سروشتێڤە (وەحی) هاتیە خوارێ:

ئایینێن ئەسمانی دان پێدانێ ب چ ئایینان ناکەن بتنێ ئێکبوونا راستەڤینە نەبیت وئایین راگەهاندن سروشتێ خودانە و دهنیریت و بنەمایێن موکمێن ئایینی ڕاستەڤینە تێدایە کو باوەری پێئینان وسەلماندنا هەبوونا تاکە خوداوەندەکیە، و گەردۆن و مرۆڤ ئینایە گۆرێ و ڕێنما و ژیری و هش و بیر پێ بەخشییە هەتا ڕێیا

وان خودێ ڤەبینیت کو چەوا گەردوون رێکخستییە هزر ژ بۆنەوەرێن خوداوەندی بکەت وهەروەسا ژ مرۆڤی بخۆ و ڕامان و هزرکرنا وی ئەڤجا باوەری پێئینان ب ژیانا پشتی مرنێ و رۆژا ساخبوونا وێ دونیایێ ولێپرسینا کریارێن خەلکی وئەوێن باش بۆ بەهشتێ ویێن خراب بۆ ئێش وئازارا دناڤ دۆزەخێ وەکو (ئایینێ ئیسلامی و کریستیان (مەسیحی) و جوهی).

## سێ - هزرکرنا زانستییانە:

بێگومان قوتابی تشتان دەربارەێ ئەو گوهۆرینێن ب سەر رامانا زانستی هاتین، دزانیت و تێدگەهیت چەوا رامانا زانستی هێدی هێدی ب بۆرینا سەدەیان هاتیە گۆرێ و پێشڤەچوی و دزانیت چەوا بەرنامە و شێوازێ کارکرنا زانستی هێدی هێدی پەیدابوویە هەتا گەهشتییە داویا وهویر کاری و رێکا ری ژ ب کارئینانا ژیری (عەقلێ) مرۆڤایەتی ل دویف ڤان خالێن خوارێ:

### ١- زانست د کەڤندا:

شۆرەشا ڤەدیتنا شونوارێن نوی ئەو شاشی رەت کریە کو دبێژیت یونانی بەری گەلان پیشکەفتینە ژ ئینانا زانستی ئەڤ راستییە شارستانیەتا دولا دوو زێ یان (میزو بۆتامیا) و مسرا کەڤن دسەلمینیت سەبارەت نێچیرێ یان خوارن لێنانێ یان چاندنێ یان خانووبەر یان تەڤن و چینن و ڕستن و تشتێن دی ژ ڤی بابەتی . . . بتنێ چاڤخشاندنەکە بۆ وان تشتان کو مرۆڤی ل سەدان هزار سالان دڤی بواریدا ب دەستڤەئینااین گرۆڤە ونیشانا قەرداریەکا مەزنا مرۆڤایەتیێە هەردەم مرۆڤێ ئێکێ و بەراهیێ کۆ ئەو هەمی تشت داهێنااینە هەتا شییایە جۆکا ڤەکەت و باژێران دابمەزرینیت و ئەردی ئاڤەدان بکەت وکانزا سازی بکەت و ئامیرێن کانزایی و داری

و کەرستێن جەنگی دروست بکەت وپێدڤی یێن خۆ ژ جلو بەرگ و خۆپاراستنێ ژ کاودانێن ئاف هەوایێ وسروشتی مسۆگەر بکەت هەر بخۆ ژی خودانێ ڤەدیتنێن هێزێن سروشتی نە وەکو ئاگرو با و ئاف ... هەروەسا ئەو داهێنان بۆ پێشڤەچوونێ ددانان دیوارێ پەروەردەکرنا هزرا مرۆڤیدا ب جورەکی ژ قوناغێن پاشتردا بۆ سەرهلدا زانستی ب رامانا وێیا راستەقینە هاریکاریێ بکەت.

ئەو زانیارییێن کەفتینە سەر ئێك هێدی هێدی وەل مرۆڤی کر کۆب شێت دەسپێکێن هزرکرنا زانستییانە بینتە گۆرێ ئێدی دکورتە بەحسەکێ وەسادا دەرفەت ژڤێ زێدەترنینە درێژیێ بڤان تێبینیان بدەین سەبارەت ب زانستی ل سەردەمێن بەری د دیرۆکا نڤیسینێ دا.

شارستانیەتێن دیروکی یان یێن نڤیسی ئەو شارستانییێن مەزن بوون کۆ بەرێ ب هزاران سالان ل کنارێ رووبارێن مەزن هاتینە گۆرێ، نیل و دولا دوو رووباران وهندستان و چین ئەڤە ل دویڤ سەردەمێن خۆ گەشە کریە وپشت ب زانستی ژی هاتیە گرێدان.

## ٢- زانستا یۆنانی:

ئەو هزرا کو دبێژیت: هندی ئەو زانست وفەلسەفا دیرۆکی یا هەی، یونانییە و ل یۆنانێ سەرهلدایە و گەلێن دولا دو روباران و دولا نیل چ نەبوویە ژبلی ئەفسان و پاشکەفتنێ . . . . ئەڤێ هزرێ باوەری پێ نەمایە کۆ خەلکی ب راستی ددانان چونکی ئەو شوونوار و گرۆڤێن زانستی کۆ ل ناف ڤان دو شارستانیان و دژیارا دییا رۆژهەلاتی دا ڤەدیتین، ئەوان بیرو بووچونە بۆ ژ دکەت و دسەلمینیت ئەوا یۆنانییان د مەیدانێن زانستی دا ب دەستڤەئینای کەفتنە سەر ئێك یا وان زانستان بوون کو بەری وان هەبوون سەبارەت ب ڤێ ڕاستییێ هزرا دەست بلندا یۆنانی چ

ڕەه نەبوینە و ڕۆناهیەك بوو دناڤ تارییێدا ئەڤجا ئەوێن ڤێ لێنرینا شاشی بەلاڤدکن، دڤێت باش بزانن: زانست وفەلسەفە ل ناڤەراستا ئاسیا بچووك و باشورێ ئیتالیا سەرهلدایە و هاتیە گۆرێ، گرۆڤەیە کو ل مسرییان وبابلییان و فینقییان وەرگرتییە و زانا و فەیلەسوفێن یۆنانی وەکو تالیس و ئەفلاتۆن و هیرۆدۆت شەهدەیا وێ ددەن ودان پێدانێ ب وێ دکەن کو زانستێن بیرکاری و گەردونناسی وتشتێن دی دناڤ رۆژهەلاتیدا ل بەری ڤانادا هەبوون کۆ دبیتن ئەڤان زانین: ژ میللەتێن رۆژهەلاتی وەرگرتینە وفێربووینە.

ژ ڤێ ژی یا گرنکتر ئەوە، کو دیروکنڤێسێن زانستی، وەك (سارتون) وچەندێن دی پشکەك ژ زانستێ میسریان و عیراقا کەڤن زۆر یان کێم زورگرتییە. گەلەك ب دوویر و درێژی سەبارەت پیشکەفتنا هونەرێ ئاڤەدانکرنێ بەحس کریە ودان پێدان ب وێ کریە کۆ دروستکرنا ئەهرامان و سکران و تورێن ئاڤدانێ و ئاڤەدانکرنێ وبەرو کانزا ئەڤ کارە درۆژهەلاتیدا نەهاتیە گورێ. هەروەسا پێشکەفتنا زانستێ کیمیا و بویاخکرنێ بۆ مۆمیا کرنێ وهونەری، زێدەباری پێشکەفتن دگەردۆن ناسێیدا ب جۆرەکی کو هندەك ژ دیرۆکنڤێسێن بیرکاری دبێژن: یۆنانییان بناغێن جەبرو ئەندازەو ڤەدیتنا رێکەکا نێزیك بۆ ڕەگی دووجای و زانیە چەوا دێ هەڤکێشا پلا دووێ شیکار کەن هەروەسا میسرییان حسابا قەبارێ هەرەمێ نەتەمام یێ چوار بنگەهی زانییە، دەستورێ حسابکرنا رووبەرێ سێگوشە و لاکێشە و بازنەیی زانییە، بەلگێن بەری وتابلۆیێن تەقنێ دەردئێخن و هەتا چ رادەکی ل نوژداریا پشکنینا سەریری پێشکەفتی بوون . . . دەستورو دەستورکاری د دۆلا دوو ڕیباران دا هاتیە ڤەدیتن. وەکو میلا حامورابی (مسله حامورابی). کو نیشان ددەت چەوا ئەڤ ولاتە ل یاسا و دەستورێ کۆمەلایەتیدا پێشکەفتی بوون دڤێت شارستانیا یۆنانی چ ئێخسبیتە سەر زانستێ مرۆڤایەتی؟

## أ- زانستێ یۆنانی یێ کەڤن:

ئاشکرایە کۆ یۆنانییان لایەنێ بیردۆزێن زانستی گەلەك بەرەڤ پێشڤەبریە، بەلێ ژلاییێ دەستکەفتێن کریاری وەك: ئاڤەدانکرنا باژێر و سکرێن ئاڤێ، ئاڤدانێ وهاتن وچوونێ و چاندنێ و کانزا کارییێ و . . . هتد تشتەکێ وەسا ژ وانا زێدەتر نەبوویە کۆ ل شارستانییێن رۆژهەلاتی بەری وان ب جه مابوون، ئەڤە ژی ب شهدەیا دیرۆك زانست نڤێسێ مەزن (برنال)ە.

بەلێ ژ لاییێ زانستێ هزریڤە، پشکداریەکا مەزن هەیە و د ڤان خالاندا کۆم دبیت:

١- ڤەدیتنا گرنگترین نیشانا زانستی کۆ (سەرتا سەری وگشتییە) (الشمولیة). وەك ئەرستۆ دبێژیت: ئەوا گشتگیری تێدا نەبیت زانست نینە، ب رامانا ڤەدیتنا (یاسا جیهانی) یان ژ تشتێ کەت و بچووك وپشکێن وان بۆ بریاردانا سەرتا سەری ئەڤە بنیاتێ پێشکەفتنا زانست و فەلسەفێ یە ژلاییێ یۆنانی یان کۆ رامانا رەپو رویتی (التجرید) دگەهینیت.

٢- ئەڤ ئارەزوویانە بۆ زانینا زانستی و یاسا رەپو رویتیا مۆرکێ (بیردۆزی) یانە بۆ زانستێن خۆ بەخشی ئەڤە ژی ئەو تایبەتدمەندییا مەزنە کۆد یرۆك هزر نڤێسێن رۆژ ئاڤایی ب سنوورێ جوداکرنێ دناڤبەرا هزرا یۆنانی وگشت ئەڤ هزرەکا بەری وان دادنن.

بەلێ دگەل گشت ئەڤ لایێن باشدا لایەنێن نەباش وشاش ژی کەفتە دناڤبەرا زانست و فەلسەفا یۆنانی دا ئەڤە ژ هەمیا گرنگتر:

أ - گەلەك ژ (سەرتا سەری) ب سەر تشتاندا و پشت گوه هاڤێشتنا سالۆخەتێن تایبەتمەندیێن تاکە کەسی و دیاردان و گشتیترین و بەرفرهەترین سالۆخەت

پێداینه و دەست ژێ بەردراینه. کو ئەو سالۆخەتێن بوونێ بۆ پێشئێخستنا زانستێ دبێ مفا بوون، بۆ نموونه دگوتن:

گرنگترین سالۆخەتێن مرۆڤی هزرکرنه ئێدی مرۆڤ دەستنیشانکرن، مرۆڤێ دیرۆکی و گیرو گرفتێن وی وچەوانیا ژیانا وی دناڤ جڤاکێن جورا و جوردا و ڕەوشت تیتالێن وی یێن جودا جودا پشتگوهاڤێتیه بتنێ (مرۆڤێ گشتی) بەسی ڤێ چەندێ بوو مرۆڤێ دیرۆکی دۆرهێلا وی بەرزەکریه.

ب - ژ ئەنجامێ ئەڤێ ژێدا سنورێ ژێکڤه کرنێ دناڤبەرا زانست و فەلسەفێ ل دەف وان بوو بەلکو بتنێ ئێك جۆرێ زانینێ هەبوو. کو بوو ئەگەرێ پاشئێخستنا زانستی، هەتا د سەردەمێن نویدا زانست سەربەخۆ بووین و بەرەڤ پێشڤەچوون.

ج - ب چاڤەکێ سڤك سەحدکرە زانستێن کریاری (العلوم التطبيقية) ئەوێن مفایەکێ کریاری دبەخشن، دڤی بواریدا پێشکەفتنەکا وەسا ب دەستڤەنەئینا کو هەژی بەحسکرنێ بیت، ئەوا زانستێن کریاری گوهۆرینان دژیانێدا دکەن هەر ژ سکر و چاندنێ هەتا کانزا کاریێ وهتد ئەگەرێ ئەڤێ ژی دابەشبوونا جڤاکی بوو ب سەر دوو تەخان (دەسەلاتدار و بەندەیان) کارو پیشه بتنێ پشکا بەندەبوونێ (العبيد) وهەژی زەلامێن ئازاد نەبوون ئەگەرێ دووێ ژی ئەو بوو: پڕانیا فەیلەسۆفان ب سڤکی سەحدکرە پێزانینێن هەستیار.

**ب- زانست ل سەدەێن ناڤەڕاستێن روچژ ئاڤا:**

زانستی د چ بوارندا پێشکەفتنەکا وەسا ب دەستڤه نەئینایه هەژی گوتنێ بیت، ژ گوهۆرینەکا نوی د تێگەهێ زانستیدا نەهاتیه گۆڕێ هەمی ملکەچی دەسەلاتا کەنیسێ بوو، ئەڤجا ملکەچییا کەنیسێ و ئەرستۆی ژی ب پێکڤه بوو، هەر دەرچوو نەك یان لادانەك ژێ دەرچوون ولادان بوو ژ پیرۆزیا ئایینێ وان. ئەڤه ژ لایێ بەرنامەیێ و ئاسۆیێن زانستیڤه.

زێدەباری ڤێ ژی شێوازێ هزرکرنێ، ئەو دانوستاندنێن بێ بەرهەم یێن کو ژ پەرتووکێن خۆ وەرگێرا بوون نەک راستەوخۆ ژ سروشت ناسینێ.

### ٣- زانست د سەردەمێن نویدا :

د ڤێرێدا دێ وان هۆکاران ئێخینە بەرچاڤ یێن کو بووینە ئەگەرێ گوهۆرینا هزرکرنێ سەبارەت ب زانست و فەلسەفێ . . . هەروەسا ل سەر وان بەندێن سەر ب بەرنامێ هێلێن بەرنامێ زانستێ نوی دێ دیارکەین و دبەندێن دیدا دێ ب کورتی بەحسێ فەلسەفێ ب ئەندازێ هندێ بۆ قوتابی یا پێدڤی بیت دێ ڤەکۆلین هەروەسا ژی دگەل دواندا دێ بەحسکەین کو سالۆخەتێن لێنرینا زانستێ نوی دروستکریە ژ ب رێبازا ئەزمۆنکاری بیت یان بیرکاری ئەنجام ب دەستڤەدان و ژیری بیت.

ئەڤا کو نهۆ ل سەر مە پێدڤی بەحس بکەین: سالۆخەتێن سەرەکیێن لینرینا زانستی وبەرنامێ زانستی وسروشتێ زانستی یێ ئەڤریە کو ئەڤەنە:

**ئێك** - نەشێن ئەو پێشکەفتنا زانستی کو ل ئەورۆپا ڕویدای، ژ دەستکەفتیێن زانستی یێن موسلمانان جودا بکەین و ژێك داببڕین.

**دوو**- ژێکڤەکرنا زانستان هێدی هێدی ژ فەلسەفێ، ئەڤ زانستە بتنێ ب ئەرکێ زانا نەهاتیە گورێ، بەلکو فەیلەسوفان ژی ڕۆلەکێ گرنگ هەبوویە ژ پێشئێخستنا زانستان.

**سێ** - پشت گرێدان ب تێبینیکرنا دیاردان و چاڤدێریکرنا ئەزموونان، ل جهێ هندێ بتنێ ب (ئاخفتنێ - لێدوان) دەست بەردای بن، ئانکو تێگەهشتنا سروشتی وچارەسەرکرنا کێشێن ژیانداریێ و لێکدانا دیاردێن سروشتی د وێ دا نەمان ل ڕێیا رامانا بیری یان ب ڕێیا نیشان و هێما گوتنێ، زانا تشتان ڤەدبینن و فەیلەسۆف ژی کۆم دکەت و فەلسەفا خۆ ژێ پێکدئینن.

**چار-** زانست وياسايا زانستی، بەرهەمێ ئەزمونان و دەرئەنجاما كارییە، ئەركێ زانا ڤەكۆلینا دیاردێن دەست نیشانكرینە، ژ ڕاستیەكا بچووك، چوون بۆ ئێكا دی، هێدی هێدی ل سەر دەستێ هژمارەكا زۆرا زانایێن بوارێن جودا جودا ئاڤاكرنا زانینێ بلندبوویە و دێ بلندبیت، پێزانینەكا باوەری پێكری و لێنرینەكا ڕاستەڤینەیا دی بۆ جیهانێ و تشتان سەرهلددەت.

**پێنج-** هەر زانستەك بۆ كارپێكرن و ڕاپەڕاندنێ دشێت. چ ئێدی ئەو زانست پەیوەندی ب بابەتێن ئەردیڤە هەبیت یان ئەسمانی، یان پێدڤیێن سادە یێن ژیانێ بیت وەكو خوارن و پاراستنا وێ ئەڤە ژی وێ دگەهینیت كۆ: زانست و هزر بتنێ بۆ لێكدانا جیهانێ وتشتان نینن بەلكو بۆ گوهۆرینانە ژی.

**شەش-** هەولدان بۆ بكارئێخستنا بیركاری و پیڤەرێن چەنداتیێ د زانستیدا، ئانكو دارشتنا یاسایێن زانستی ژێچێكرنەكا (صياغة) بیركارییانە ئانكو د شێوێ ڕێژێن هژمارییێدا، بۆ نموونە: بلا نەبێژین ئەڤ تشتەیێ گەرمە، بەلكو بێژین گەرمییا وی (٣٥) پلا سەدییە، ئەڤە دانانا ڕێژەیا هژمارییە بۆ پلا شیانكاری (ئیحتمال) و ڕاستەڤینەیی و هەڤجۆتكرنا یاسان ب سەر بارودۆخێن هاتینە ڤەكۆلینكرن.

## تایبەتمەندیێن هزركرنا زانستییانە :

هەر چەندە ڤەكۆلەر ژ گیرو بوون و پێشئێخستنا ڤان تایبەتمەندییا دجودانە، بەلێ دبیت هەمی ل سەر ڤان خالێن خارێ د ڕێكەفتربن كو ئەڤەنە:

### ١- كەلەكەبوویی - كەڤتنە سەر ئێك - (التراكمية):

زانست پێزانینەكا كەلەكە بوویە، پێزانینێن زانستی وەكو ئاڤاهیێن بلند كو ڤات ل سەر هاتیە ئاڤاكرن، بتنێ ئێك جوداهی هەیە، ئەو ژی ئاكنجیبوویێن ڤان

ئاڤاهیان زانستییە، بەردەوام بەرەڤ ڤاتێن نوییێن سەری دهێنە ڤەگوهاستن، ئەوێن ل بنواندا ب جه دهێلن، دڤێدا زانست ژ هونەری دهێتە جوداکرن، هونەر ب شێوەکێ ئاسۆییانە (بەرفرهەدبیت) وگەشە دکەت، ئاشکرایە ئەم مفای ژ هونەرێ کەڤن وەردگرین، بێ کۆ هندێ هونەرێ نوی بشێت وەل مە بکەت دەستبەردایێ کەڤن ببین، دبیت فەلسەفە ژی هەروەسا بیت، فەلسەفا نوی، ئەوا بەری خۆ ناژێبەت و بەرزە ناکەت، دگەل هاتنا هەر فەلسەفەکا نوی ئەو فەلسەفا کەڤن نابیتە دیرۆکەکا ڕویت، وەکو دزانستێدا رویددەت وبیردۆزێن کەڤن دبیتە روێدانەکا دیرۆکی یا رویت، ئەڤ سالۆخەتێ کەلەکەبوویی، سالۆخەتێ سەرەکی یێ راستییەکا زانستیانە دەردئێخیت کو رێژەییە ب رامانا زانست گەشە دبیت وئەو ب راستییەکا زانستییانە دانایە پشتی ماوەکی گوهۆرین تێدا کرینە یان ب ئێکجاری لادایە و تشتەکێ دی جهێ وێ گرتییە، هەر ئێك ژ بیردۆزا (بەتلیمۆس) یان فیزیکا نیۆتن ل سەر دەمێ خۆدا دبێ سنوور بوون، بەلێ لێنرینا نویا گەردوونی ب بیردۆزا کۆ پەرنیکۆس وهەروەسا فیزیایا ئاینشتاین جهێ وان گرتییە ئەڤە ئانکو رێژەیی یە ل هەمان دەم ژێدا بێ سنورە (مطلقة) چونکی راستییەکا بابەتییا بێ لایەنە، پابەندێ ب هەست و سۆزێن مەڤە نینە وەك مفایێ هونەری تابلۆیەك نینە، د ڤێدا بێ سنورە کو د سەر دەمێ خۆدا (ڕاست) بوویە. زانست ئێکبوونا ئاڤاهیێ خۆ بلند دکەت ، بەرەڤ ئەفسانا ناڤەگەرێتە ڤە. ئەڤە ژی رامانا سییێیێ یە یا بێ سنوری یا راستییەکا زانستییا نەیە، دەست پێکر، نهۆ وەسا گەهشتییە ڤەکۆلینا مرۆڤی ب بەرنامە ونەخشە ئەڤە ژی بوارێن کومەلناسی و دەروناسی ڤەدگریت.

## ٢- رێکخستن:

زانست ڕێکخەرێ رێبازا هزرکرنا مەیە ورێکخەرێ شێوازێ ژیریا مەیە (عقل) ئەڤە ب ڕامانا زالبوونا ب سەر ڕەوشت و تیتالێن مەیێن ڕۆژانە یە، بن دەست ئێخستنا هزرا مەیە بۆ ئیرادا هوشمەندیا مەیە.

## ٣- سەرتا سەری - وبابەتخوازی (الشمولية والموضوعية):

پێزانینا زانستییانە یا سەرانسەرییە، ئانکو: گشت نموونەیێن دیاردێ ڤەدگریت، پەیوەندی ب سەر دیاردێن کەسان ڤەنینە، دەمێ زانست بەحسێ کەفتنا خوارێ یا تەنان (الأجسام) بکەت، ئەو ئاخفتن یان ئەو ڤەدیتن، پەیوەندی ب بەحسکرنا کەفتنا خوارێ ئا ئێك تەن ڤە (جسم) نینە ژوان تەنێن وەکو خۆ ژ لایەکی و ژلایەکێ دیڤە راستییا زانستییانە د وێدا گشتگیرییە کو هەر ژیریەك (عقل) شارەزا بوو ب پەسەندی ددانێت و باوەریێ وئەزموونا تایبەتی یا هەستێن تایبەتیێن وی کەسی بناغێ مفا وەرگرتنا هونەرینە، بڤی جۆری (نەکساتی) دبیتە سالوخەتێ ڕاستییا زانستییانە، کول بێگومانیا خۆ یا جودایە، ئەڤە هەست پێکرنا کاکلکا وی کەسییە کو ژ خۆ ل تشتەکی یێ بێ گومانە، کو داویێ مۆرکا کەساتییێ وەردگریت و ژ ئێکی بۆ ئێکێ دی یا جودایە چونکی خۆیەتیە نەك (بابەتی).

## ٤- هویرکاری (الدقة) وهزرکرنا وەسفی (چەندایەتی) نەك چەواتی:

زمانێ زانستی وەکو زمانێ ئاسایی نینە ب هویرکاری (بالدقة). د زمانێ ئاساییدا هەست پێدکەین بێژین: دلێ من وەسا دبێژتە من، یان وەسا بۆ دچم یان وەسا دبینم ئەڤ پەیڤە دتەمامن و مەرەمێ دەردبرینن، بەلێ بۆ زانستی ئەڤ زمان و ئاخفتنە بتنێ بەس نینە دڤێت زمانێ بیرکاریێ ب کاربینیت ب تایبەتی د سەردەمێ نویدا.

## چار: هزرکرنا فەلسەفیانە:

ل دەسپێکێ سەبارەت ب فەلسەفێ و ئاستێن وێ وژێدەرو ئارمانجێن وێ و پێناسین و بابەتێن ویێن سەرەکی وپرسیارێن ویێن گرنگ وجوداهیێن دناڤبەرا وێ و دناڤبەرا هزرکرنا ئەفسانەیی وئاینێ زانستییانەدا مە بەحس کریە ژبەر ئەڤێ دڤێریێدا گەلەك ل سەر دەڤەرێن دی ب شێوەکێ تایبەتی موژیکی کۆمکرنا تایبەتمەندیێن سەرەکی یێن ڤی جۆرێ هزرکرنێ بین.

### تایبەتمەندیێن هزرکرنا فەلسەفییانە:

#### ١- فەلسەفە وەکهەڤە ب هزرکرنێ:

فەلسەفە هزرەکە ژ گەردوونی ول مرۆڤی هەتا هزرکرنەکە ژ هزرا خۆ، ڕوونتر بێژین: ئەم دەمێ ل سەر ئەفسانا و زانستێ سروشتی دئاخڤین هەلویستێ سێربەندیێ و زەلامێن ئایینی و زانایێن مە ب کارنائینین بەلکو ئەم فەلسەفا خۆ تێدا دکەین یان شرۆڤەکرنا خۆ ل رێیا هزرکرنەکا فەلسەفییانە دئێخینە بەرچاڤ، هەتا دەمێ موژیلی شرۆڤەکرنا پێناسێن شییایی یێن فەلسەفێ بووین نەخشێ تایبەتمەندیێن دیێن سەرەکی و ژێدەر و ئارمانجێن مە دکێشا. ئەوی دەمی ژی هەر فەلسەفێ کارتێکرن لێ دکر.

#### ٢- فەلسەفە پرسە، یان پرسەکا مەزنترە

ئانکو پرسەکا بەردەوامە، بەلێ یا هاتیە گوتن: پرسیار د فەلسەفێ دا ژ بەرسڤان گرنگترە، چونکی فەلسەفە بەرسەڤەکا ئێکجاری و دووماهی نادەت،

چونکی بەرسڤا داویێ، داوی هاتنا فەلسەفێ بخۆیە، بتنێ داوی هاتنا هەمی هزرکرنایە، فەلسەفە بەردەوام تشتان ب شێوێ پرسیارێ دادرێژیت، گشت بەرسڤا ژی، هەر فەیلەسوفەك ل دویف هەر ئاریشەکێ ددەت. نرخ وبهایێ وی دوێرێ دایە فەیلەسوفەکێ دی دشێت د رێکا دانوستاندن و هەلسەنگاندنا شاشیان دا، بشێت وێ پرسیارێ ب شێوەکێ باشتر و گونجای تر دابرێژیت. ئەڤجا ژبەر هندێ فەلسەفێ باوەری ب بریار و هوشمەندان هەیە کو مافێ دەربڕینا بوچونێن خۆ هەبیت. گرنگترین تایبەتمەندیا فەلسفەکاریێ وپرسێن فەلسەفی ئەوە ل سنۆرێ چاڤدێر یکرنێ یە، یان ئەزموونێ، یان کەفتن و پرت کرنێ دا ناراوەستیت و، تشتان وەکی پارچەکا پەرش و بەلاف نابینییت، وەکی موریکێن ڤەبژیایی یێن تسبیحێن پڕچیای، یان بەندکەك نەبیت وان گرێدەتەڤە. بەلکو هەول ددەت ئەڤان پارچان وپشکان و، ئەڤان دیاردا ب دویف ئێکدا هاتین هەمیان پێکڤە گرێدەت. هەتا دگەهیتە ئەوان تێگەهێن سەرتا سەری هەمی پشك و پارچان پێکڤە گرێ ددەن وهەمیان پێکڤە لێکددەن، ها بڤی جۆری فەلسەفە ل دویف دیاردێن ماددی دگەهیتە تێگەهێ (سروشت) و، دەربارێ ب بوونەوەرێن ژیر ژی دگەهیتە تێگەهێ (مرۆڤایەتی) و حەزێن پێزانینان، هەروەسا دگەهیتە تێگەهێن پێکڤەگرێدانا ئەگەری (سببی) و پەیڕەو وئارمانج و گەشەسەندن دەربارێ گشت دیاردو بوونەوەران.

ئەڤ ئەرکە ب بتنێ پسپۆراتی دبیاڤێ زانیاریان وئەو بیاڤێ زانست و شارەزایدا ناهێتە گۆرێ. ژڤی پتر دڤێت، ئەڤە پسپۆراتیا فەیلەسۆفی یە کو د هەمی ڕوویدان و دیـاردەکێ دا، چ، د بیاڤێ سروشتی دا بیت یان د بیاڤێ ڕەوشت و بهایان دا بیت،

داویا بنەما و ڕەگەز و ژێدەرێن دی هەلسەنگینیت وبەراهیێ گەلەك ژڤان پڕسان و ئاریشان دئێخستنە بەرچاڤێ قوتابیان.

### ٣- فەلسەفە ڕەخنە وشرۆڤەکرنە:

ژ تایبەتمەندیێن بنەرەتیێن هزرکرنا فەلسەفی، ئەوە کو هزرکرنەکا (ڕەخنەی - شرۆڤەکارانە)یە، چونکی فەیلەسۆف هەردەم موژویلی شرۆڤەکرنا ڕەخنەیێن ئەوان زانیاریان وبیر و بیردۆزان وبۆچونانە کو دبەلاڤن، ئەڤجا چ ب ئاشکرای بیت، یان ناڤەرۆکا وێ یا نەئاشکرا، د ڤێرە ژی دا مەرەم ئەوە ڕاستی و دروستیا وانە، ئانکو سەختە و نەدروستیا وان بەرچاڤ بکەت. ئەو بنچینێن زانیاریانە کو ئەو زانیت ل سەر ئاڤاکریە نموونا ئاشکرایا دئەڤێ ددیرۆکێ دا یا هەی، وەکی (غەزالی) کو دەست دایە ڕەخنەگرتنا بنەماییێن زانیاریان، وەکی ئەندامێن هەستکرنێ وزانیارییێن هەست پێکری. باوەری و گرۆڤێن نەحەزێن ئایینی و، ژیری و زانیارییێن ژیری (عقلیە) و، هەروەسا (دیکارت) ژی دەمێ بریارا خو دای، باوەری ب هەمی بیرو بوچونان هەبوو، خودا داقوتا پشتی گەریان و پشکنینێ ووەستیانێ، ئەو هەردوو ڤەگەریان بۆ زانیارییێن بێ گومانێ (یەقین). فەلسەفە هەر ب ڕەخنەگرتنا باوەر وزانیاریان و بیردۆزان نا ڕاوەستیت بەلکو ئەرکەکێ دێ دئێخیتە ستوویێ خۆ کو ڕەخنە وشرۆڤەکرنا وهەلسەنگاندنا ئامرازێن زانیارییێن خۆیەتی، وەکی هەستان و ژیری، هەروەسا دەربارەی (دەلیڤا دامەزراندنا زانیاریان) وئەو (ڕیبازێن دکەنە زانیاری) ودیارکرنا مەرجێن زانیاریێ و . . . هتد کو هەمی دچنە چارچوڤێ (بیردۆزا زانیاری) - ئەپیستمۆلوژیا کو دێ ل داویی

خوینین، هەروەسا ئەرکێ ڕەخنەیا شرۆڤەکرنا یا فەلسەفی، ئانکو (ڤەکۆلینا بەرنامان) دبەخشیت کو زانستێن جۆرا و جۆر دروست دکەن، وەکی بیرکاری و سروشتکاری. دپێخەمەت ڤەدیتنا وان بنەمایان کو ل سەر وێ ڕاگرتی بوون ل دویڤ بەرنامەکێ سەربخۆ و ئێکگرتی.

## ٤- فەلسەفە، پێکئینان و دروست کرنا باوەریانە و، ڕامانە:

ئەڤ تایبەتمەندیە تایبەتی و بەردەوامیا فەلسەفێ بوویە ژبوونا وی هەتا نهۆ ئانکو دروست کرنا ڕیبازێ یە، ڕیباز و هەلۆیستێن هزریێن سەرتا سەری، د ڤێرە دا گرنگیا تایبەت ب وان دەرئەنجامێن نەچاڤەرێ کری دهێتە دان کو پێکڤە گرێدانا گشت ئەو زانیارییێن ب دەست هێن کو مروڤی کومکرینە، هەروەسا ل هەمی ئەزموونێن گشتییێن مرۆڤی ژی نە نەك ل گرنگی دان ب بەرنامە و کەرستێن ب کارهاتین.

د ڤێ چالاکییێ (پێکئینان و پێکڤە گرێدانا زانیاریان)دا فەیلەسۆف ل دویڤ گشتی ترین بیروبۆچونێن شیانا وی دادگەریت ل دۆر گەردوون و مرۆڤ و سروشتێ دوور هێلی و ڕامانا ژیانێ و بنەمایێ هۆش د پایەی و چارەنڤیسی ... هتد مەرەم د ڤێرەدا بەرفرەهیە و سەرتا سەرتیە، ئانکو گەهشتن دڤەدیتنا دیتنەکا کوم گشتیانە، دڤێردا فەیلەسۆف ل برێ زانین و پسپۆراتیا وی ل وان ناڤەندو دەزگەهان دچیت کو پێشوازیا هەر ئەنجامەکێ زانستێن جۆرا وجۆر وشارەزایان ب کومەل بۆ مرۆڤی پێشکێش دکەن، فەیلەسۆف وەکی (فرانسیس بەیکون) دبێژیت فەیلەسوف وەکی مێشا هنگڤینیە کو ناڤکا گولان دمێژیت، هەتا کو هنگڤینی بۆ مە دروست دکەت، یان وەکی (مایسترۆ) یە پێشەنگێ ئورکێسترایە.

## پرسیارێن پشکا دووێ

پ ١/ تایبەتمەندییێن هزرکرنا ئەفسانەیی بژمێرە وب درێژی ل سەر ئێك ژ وان باخڤە.

پ ٢/ لێکدانەڤەیێن جورا وجورێن سەرهلدانا ئایینی ڕوون بکە.

پ ٣/ تایبەتمەندییێن هزرکرنا ئایینایە چنە؟

پ ٤/ چاوانیا (زانستی) دجیهانا ڕۆژهەلاتا کەڤن دا (بەری یۆنان) ڕوون بکە.

پ ٥/ لایێن باش و شاشییێن زانستێ یۆنانی یا کەڤن کیژن.

پ ٦/ تایبەتمەندییێن زانستی دسەردەمێن نوی دا کیژن.

پ ٧/ تایبەتمەندییێن هزرکرنا زانستیانە ڕوون بکە.

پ ٨/ تایبەتمەندییێن هزرکرنا فەلسەفەیانە ڕوون بکە.

## پشکا سیێ

# بابەتێن گشتی یێن فەلسەفێ

ل بەراهیێ مەگوت دکەڤندا فەلسەفە ڕامانا زانست و زانیاریێ دگەهینیت فەیلەسۆف زانایە و حەزا زانابوونێ هەیە وب هەمی زانیارییێن سەردەمێ خۆدا ئاگەهدار بوویە، بەلێ گەشەپێدانا زانستێن جۆرا و جۆر جودابوونا تایبەتمەندییێ دزانستیێ دا ب ئەگەرێ سەربەخۆیا ڤان زانستان وسەرهلدانا زانستا نوی کو هێدی هێدی ژ فەلسەفێ دوویر کەفت کو دبەراهیێ دا ب دایکا زانستان دهاتە دانان.

فەلسەفە ب سێ بابەتێن وێ یێن سەرەکی و چەند لقەك ما و ژبلی هندێ هەڤبەندیا وێ ژی دگەل زانستێن سەربەخۆ یێن دی ل جهێ وێ ماڤە وئەڤ جۆرێ هەڤبەندیێ ب فەلسەفا زانستی ناڤکریە.

بابەتێن گشتی یێن فەلسەفێ پێکهاتینە ژ: **هەبوون یان چ هەیە پشتی سروشتی (ما وراء الطبيعة) (فەلسەفا سروشتی ژی ڤەدگریت). بیردۆزا زانیاری و بهایان کو ڕەوشت ناسی و لۆژیك (المنطق) و جوانناسی ڤەدگریت). پشتی وێ دێ فەلسەفێن زانستان دگەینە دگەل کو ژهەمیا گرنکتر فەلسەفا یاسا و فەلسەفا ئایینی وفەلسەفا دیرۆکی و فەلسەفا سیاسی و دەرون ناسیێ دکۆمەل ناسیێ وتێکراییێ دیرۆکا فەلسەفێ و پەروەردە ناسیێ (زمان ناسی)نە، ل خوارێ کورتەیەکا وان** بابەتان د هندەك لق و پاسبەندێن فەلسەفێ بەرچاڤ دکەین:

**ئێك:** بابەتێ هەبوونێ (چ هەیە پشتی سروشتی) (میتافیزیك) و فەلسەفا سروشتی ڤەدگریت ڤەکۆلینا هەبوونێ ژ هندەك لایان ڤە، زانستێن سروشتی ل هەبوونێ ڤەدکولن وەکی تەنەکێ گوهۆر. سروشت ناس ل تایبەتمەندیێن تەنی

(جسم) ڤەدكۆليت بێ سەحكەتە توخمێن وێ. بەلێ كێميا ل پێكهاتێن وێ ڤەدكوليت وبۆ توخمێن وێ دبەتەڤە. زانستێن بيركارى ل هەبوونێ ڤەدكولن ژلايێ هندێ كو هندەك ژوا نبرە - چ ژمارە بن (زانستێ بيركارى) يان شێوەێن (زانستێ ئەندازيارى). زانستێن دەورونى ل دياردێن دەروونى ڤەدكۆلن. زانستێن كومەلايەتى ل پێكهاتێن و دياردێن كومەلايەتى ڤەدكولن. دناڤ ڤان زانستان دا زانستەك نينە ل هەبوونێ ڤەكوليت، هەبوون چييە؟ ئانكو بوون ب گشتى و نەهێتە بشك كرن. ئەڤ زانستە لايێ كەڤناران دگوتێ: چ هەيى پشتى سروشتى (ميتافيزيك). ڤەكولينا (هەبوون)ێ ڤەكۆلينا تايبەتيێن گشتى يێن هەبوونێ ڤەدگريت.

ب دانانا بيردۆزەكێ دەربارەى سرەوشتێ جيهانێ و، وەسا بهێتە تەماشەكرن ئايا ڕوويدانێن گەردونى ودياردێن سروشتى ل سەر ياسايەكا چەسپاى هاتيە دامەزراندن يان ب نويشكەكێ ڤە (صدفة) ئايا ئەو ڕوويدان ب خۆ سەرهلددەن يان ب هوكارەكێ پێدڤى و ل دويف ياسايێن ماددە و لڤين بزاڤا سروشتى دچن؟ ئەڤ ڤەكۆلينە سەبارەت تايبەتيێن تەنێن سروشتى و ، هەبوونا سروشتى دكەڤندا هەتا دەمێ (نيوتن)ى گوتێ (فەلسەفا سروشتى) (زانستێ سروشتى) يان فەلسەفا سروشتى ژلايێ كەڤناران دا ب بيركارى و (چ هەيى پشتى سروشتى)، بشكەكا فەلسەفا بيردۆزێ بوو. نهۆ كو ڤەكولينێن زانستێن سروشتى سەربەخو بوون و، ڤەكولينێن گشتى بوون ل (چ هەى پشتى سروشتى) (ميتا فيزيك) مانەڤە.

## ( ميتا فيزيك ) ( چ هەى پشتى سروشتى )

لقەكە ژ لقێن فەلسەفێ پيتەى ب ڤەكولينێن تايبەت ب جيهانێ و مروڤى و زيندەوەران ددەت. هەتا ڕادێ تێگەهشتنێ دشرۆڤەكرنا لوژيك (المنطق) ب ئاميرێ زانياريێ دهێتە دانان يان ڕاستى زانى و بيردۆزا زانيارێ ژى ب ڕێك و ڕێبازێ

ڤەدکۆلیت میتا فیزیکی ژی ڕاستییان دئێخیتە بەر ڤەکۆلینێ ئەڤجا چ ل جیهانێ ب گشتی یان زیندەوەران یان مروڤان بیت.

**أ- مەرەما میتافیزیکی:** جیهان و گەردوونا دەوروبەرێن مە هەتا مرۆڤ و زیندەوەر ژی. ئەڤ هەمی تشتە یێن هەمە جۆر بێ سنوور دیاردکەن مرۆڤ دەمێ کو سەحکەتە تشتێن دەوروبەرێن خۆ فرەهی (التعددیة) و هەمە جۆریێ ناڤبەرا زیندەوەران و. ب زەحمەت دشێت هەڤبەندیێ ناڤبەرا وان پشت ب لێکدانە ڤێ بگرێددەت. گرنگیا میتا فیزیکی ژی کێم کرن و سادە کرنا هەمە جۆریێ یە و ئینانا جۆرە ئێکبوونەکێ کو هەمی هەبوونەوەران ل ژمارەکا کێما بیرو باوەر وتێگەهـ و بووچۆنێن وان ڤەدگریت.

**ب- جوداهی دناڤبەرا خواندنگەهێن میتا فیزیکی: خواندنگەهێن میتا فیزیکی دجودانە سەبارەت:**

**١- تەماشەکرنا ناڤەرۆکا گەردوونی یان ڕاستییێن بنچینەیێن گەردوونێ:**

- **ئێکاتی -** ب ناڤەرۆکا ڕاستیێ دهێنە هژمارتن وب وێ یەکە ئەو تشتێن ژبلی وێ، ئەوێن دی دیاردە وەسفا ئەڤێ ناڤەرۆکێنە.
- **جووتەکی -** دبێژیت دووناڤەرۆك بۆ ڕاستیێ هەنە، یان دوو ڕاستییێن بنچینەیی هەنە چ ژوان بۆ ئەوا دی ناڤەگەریت.
- **هەمە جۆری -** ئەڤە وەسا دبینیت کو هەمە جۆری ناڤەرۆکا تشتانە ب سەرجەمێ ئەڤان ناڤەرۆکان پێکدهێن وب بەرزەبوونا وان بەرزەدبن.

**٢- تەماشەکرنا نەگوهۆڕ و گوهۆڕی:**

ئەڤ میتافیزیکیە ڕاستی ژلایێ وان ڤە نەگۆرە و گوهۆرین خەیال و شاشیە و دیاردەکا بێ بها دچیت، دبێژن گوهۆرین هەڤدەم راستیا ناڤەڕۆکا هەبوونێنە و ئەڤ ناڤەڕۆکا کو دوڕێن مەنە دێ بینین بتنێ پەردەکە یا ڕاستیا هەڤدەم.

## ٣- هەلبراتنا ناڤەڕۆك وبنچینێن هەبوونێ

- **نموونەیی** - تەماشکرنەکا میتافیزیکیه و گیان و هزر و بهایێن نموونەیی وەکی (چاکیێ) ب بنچینه و ناڤەڕۆکا هەبوونێ دهێته دانان ژبلی ئەڤان ژی ئەوێن دی دیاردەکا مام ناڤنجیا هزر و گیانینه.

- **مادده** - ئەڤه ماددەنه . . . ب بناغه دناڤەڕۆکا هەبوونێ دهێته هژمارتن و دبێژیت تشت ڤەگەراندنا وان بۆ مادده و یاسایێن وان دهێنه شرۆڤەکرن.

## ٤- چاڤ خشاندنەك ب ناڤ هەڤبەندیا ناڤبەرا خۆیەتی وبابەتێ هەبوونێ (الذاتیة والموضوعیة)

پەیدابوونا بیردۆزا زانیاری وەك لقەکێ گرنگێ فەلسەفێ ل داویا سەدێ (١٧) و دەستپێکا سەدێ (١٨) و تێبینی ل تەماشەکرن بۆ ڕاستیێ و هەبوونێ و جیهانێ سەبارەت بابەتی ڤە یان تشتێن خو دەرەکیێن بۆ خۆیەتیێ ب ئاگەه و هوشیاریێ (ادراك) ڕاکێشایین وەلێهات هندەك ژ فەیلەسۆفان ل بن سیبەرا هوشیاریێ (ادراك) وخۆ ئاگەهیێ ب بابەت و جیهانێ چاڤێ خۆ بریه یان تەماشەکریه بابەتێن گشتی. فەلسەفە ب مسۆگەری هەڤ دژێ ئەڤێ بۆچوونێ بوویه بهندێ کو جیهان د هەبوونێ دا یا سەربەخۆیه ودویره ژ هوشیاریا ئەم پێڤە، مەگوتی ڤەکۆلینا (هەبوون) ڤەکۆلینا هەبوونێ یه ب شێوەکی ڕه و ڕیشالی یه ئەڤەژی بهانەکا پێدڤیا ئەڤێ ڤەکۆلینێ یه چونکی هەر زانستەك ڤەکۆلینا لایەنەکی یا پشکاکا هەبوونێ یه (هەروەکی مه نموونه ب بیرکاریێ وکیمیاییێ و هتد . . . ئینایه). ژبەرهندێ پێدڤی یه زانستەك هەبیت ل تێکراییێ هەبوونێ ڤەکۆلیت، بەلێ فەیلەسۆفێ ڤەکۆلەرێ هەبوونێ دارستانەکێ وەکی دارستانێ دبینیت نەك دارو باران بتنێ. و بەهانەکا دی بو ئەڤێ ڤەکۆلینی ئەوه کو هەر زانستەك پەسەند و

دەستپێکان بکاردئینیت بێ دەرئێخستنا ڕاستیێ یان ب گرۆڤە، بۆ نموونە زانستێ ئەندازیاری ب پەسەند و گرۆڤە دەست پێدکەت وەکی دوو هێلێن هەڤ تەریب ناگەهنە ئێك، گەلەکێن دی ژبەلگەنامێت بەرنیاسێن (ئۆگلیدس) کو هەمی پشت ب مەگرتیێن جهی گرێددەن بێ ڤەکۆلینێ ل چ هەیی و ڕاستیا وێ زانستێن سروشتی ژی وەسا ددانێن کو کەرستەیێ هەی وئەو یاسایان بو ددانێن، یاسا یا (ئەگەری) و (بەروڤاژی) ب مەگرتیان وەردکرن، بەلێ ئەرکێ ئەوان نینە ل ڕاستیا کەرستەی یان (دروستیا ئەگەرێ وی) و (بەروڤاژی) ڤەکۆلیتن، ئەوا لڤی دڤەدکۆلیت (میتا فیزیك)ە یان (زانستێ هەبوونێ)یە و، هەروەسا سەبارەت تێگەهێ دەم و ڕۆژان.

## دوو: بیردۆزا زانیاری (ئیپستیمۆلۆجی):

**ئەڤ ڤەکۆلینە بەرسڤا ڤان پرسیارێن ل خوارێ ددەت:**

**أ- زانیاری چییە؟ پرسەکە سەبارەت زانیارییێ دخۆدا.**

**ب- زانیاریێ ژ چ وەردگرم؟ ئەڤە پرسەکە سەبارەت نەژادێ زانیاریێ و ژێدەرێ وێ.**

**ج- ئایا دبیت زانیاری بهێتە وەرگرتن؟ ئەڤە پرسەکە سەبارەت دروستیا زانیاریێ و سنووریێ وێ.**

بابەتێ زانیاریێ فەلسەفا نوی دروست نەکریە، فەیلەسوڤێن هەمی فەلسەفێن بەرێ ئەو جۆرێ پرسیاران کریە، بەلێ ل ناڤ بابەتێ هەبوونێ یان بابەتێ سروشتی وجیهانا دەرەکی دا ل وان ڤەدکۆلیت. بەلێ فەلسەفا نوی هەروەکی دئارمانجا فەلسەفێ دا وگرفتا زانیاریێ بوویە گرنگترین پشکا فەلسەفێ وژوێ ڤە تەماشەی گرفتا هەبوونێ دهێتە کرن. بیردۆزا زانیاریێ د بیاڤێ زانیاریێ ڤەدکۆلیت، ئانکو گومان کرن (ڕاستی) یان مسوگەربوون ژێ وجوداکرنا زانستێن ب گروڤە، ژ زانستی پەیدا کری، یان زانیاریا دەست نەکەفتی و زانیاریا دەست کەفتی

د ئەزموونان دا، ڤەکۆلینا مەرجێن زانیاریا مسۆگەر. جوداکرن و خۆیەتی یا د بابەتەکی د زانیاریێ دا. ژێدەرێن زانیاریێ چنە و چاوا پێزانین ب تشتان، هاتیە زانین هەڤبەندییێ گرێدەدت، بۆ نموونە چاوا دێ زانم ئەڤە کورسیکە ونەپشیکە.
دێ ڤەگەرینە ڤە سەر پرسیارا (أ) زانیاری چییە: د ڤێرەدا دو رێباوەرێن (مذهب) مەزن ل دۆر ئەڤێ پرسیارێ دێ بینین: یا ئێکێ دبێژیت ئەوا هەستێن مە و ب ژیری دزانین، ئەنجامێ تشتەکێ ڕاستەقینە ژدەرڤە هەیە ژ تێگەهشتنامە جودایە. ئەڤجا زانیاری ل دویف وێ پێزانینا تشتانە ب رێکا هەستان وژیر یێ وەکی خۆ کو دجیهانێ دا هەیە. تشت یێ هەی ڕەشە، یان سۆرە چونکی ب خۆ وەساییێ هەی کو ڕەش کریە وهەست ب ڕەشاتیا وێ یا سۆراتیا وێ دکەین. ئەڤ خۆیەتی یە مسۆگەریاهەی، ئایا کەسەك دبینیت یان نابینیت؟ دبێژنە ئەڤێ (ڕێباوەری یا دوورهێلییێ (واقعی) وبەرامبەری ئەڤێ (ڕێباوەریا دیاردان) یان (ڕیباوەریا هزری) هەیە کو وەسا دبینیت (تشتان دخۆدا) دبینیت و (پێزانیا تشتان، ب دەربڕینەکا دی (ئەوال دەرڤە) و (ئەوا دهزردا) گەلەك دجودانە. لدویف ئەڤێ زانیاری پێزانیا تشتی نینە وەکی دجیهانێ دا هەین و وێنەیەکێ، وەك خۆژی نینە وەك دوورهێل دبێژن، بەلکو پێزانیا تشتانە وەکی بۆمە دەردکەڤیت و، جیهانا دەوروبەرێن مە ژی دروستکرنا ژیریێ مەیە. سەبارەت پرسیارا (ب) کو ژ چ زانیاریێ وەردگرم، ئانکو ژێدەرێ زانیاریێ چییە؟

هەروەسا د ڤێرە ژی دا دو ڕیباوەر هەنە: (ئەزموون کار) یان (هەستی کار) گوتیەئەزموون ژێدەرێ زانیاریێ یە یان ژلاییێ کێم ڤە بنچینێ وی یە، ئەزموون ژی دوو جۆرە: یان ژ هەستێن دیار وەرگرتیە وەکی گوه لێ بوون ودیتن، یان ژ دەروونی ڤە. پێزانین تشتێن دەرەکی وەك دیتن، ئەڤ کورسیکە یا سپی یە و هەستپێکرنا وی دبێژیت بێزانینا (تشتێن دەروونی یا ڕامانی) پێ دهێتە گوتن. و

گوتیە ئەگەر کە سەك هەمی هەستێن وی نەمینین ژ تشتەکی سەبارەت ئەوێ کو ل ناڤ وی دا هەی نزانیت. بەرامبەری وان ژی ڕیباوەرێن (ژیری) گوتیە: **(زانیاری ب هزرو ژیری دهێتە پەیداکرن، ئەڤە ب ڕێکا هەستان ڤە بۆ ژیری دەردکەڤیت ڕۆخسارێن دەرەکیێن تشتانە ویێ خاپینەرە وجهێ ڕاستەقینەی نینە کو هەست پێ ناهێتە کرن و هەست شاشیێ دکەن، بەلێ زانست وفەلسەفا ل سەرگشتیێ وپێزانینان هەڤبەندی نەبیت ناهێتە دامەزراندن)**، بۆ نموونە (ئەگەرێ وێ) یێ ژیر، ناهێتە کرن. دویڤدا چاڤ ل وان تشتان تێبگەهین کو هەست پێ ناهێتە کرن وەکی (خودێ) و (بەردەوامی) هندەك ژوان ئەزموونان گەلەك چوون: بۆ هندێ چوون کو تشت ژدەرڤە ناهێتە ددەروونی دا و نەشێت ئێك تشت دابنین ئەگەر هاتوو ودبنەڕەتدا نەبیت بەلێ پرسیارا سیێ کو (ج)، دبێژیت ئایا دبیت زانیاری بهێتە وەرگرتن؟ ئانکو ئایا زانیاری یا مسۆگەرە؟ دڤێرەدا مە سێ ڕێباوەڕ هەنە: ڕێباوەر هەیە کو شیانا زانیینا تشتێن مە هەیە. بەرامبەر بڤێ ڕیباوەڕێ یا دووێ وسیێ هەنە بەلێ یا دووێ ڕیباوەرا گومان وخودان دان پێدانێ نینە ب شیانا زانیاریێ وشیانا مرۆڤی ب سەر زانیاریێ، وچ ڕایا نادەن. بەلێ ڕێباوەرێ سیێ ڕێباوەرێ (ڕەخنە گری)یە ئەوان یا گوتی بەری ئەم ل سەر مسۆگەریا زانیاریێ یا گومان لێ کرنێ باخڤین، ل سەر مەیە کو ل سنۆرێ زانیاریێ ڤەکۆلین بۆ نموونە ئایا هەستان وپێکهاتنا (ژیری) ئەم دشێین تشتان بزانین. ئەگەر دشێین هەتا چ ڕادەیەك؟ کو (ئەمانوئێل کانت) پەیڕەو کری یە.

### أ- بیردۆزا زانیاریێ:

لقەکە ژ لقێن فەلسەفێ ل سروشتێ زانیاریا مرۆڤی یا جۆرا و جۆر و پلێن جودا جودا ڤەدکۆلیت سنۆر و شیان داریا وێ ژی دەستنیشان دکەت.

### ب- پلێن زانیاریێ:

زانیاری یا پله داره ژ گومان و بۆچوون و هەستی (الحواس) دەست پێدەکەت ب هەستێن هزری دا دبۆریت هەتا دگەهیتە مسۆگەریا تمام پلا گومانێ لێ نەهێته کرن وەکی ئەو نموونەێن کو ل بیرکاریێ ولۆژکێدا دەست مه دکەڤیت ١ + ١ = ٢، س = س زانیاریەکا ڕاست و ڕەوایه گومان لێ ناهێته کرن، ئەڤە ژی نموونەیەکە کو زانا و مرۆڤ و فەیلەسۆف حەز دکەن بگەهنێ بەلێ گەهشتن بۆ وێ ڕاستیێ هەردەم یا ب ساناهی نینه لەوڕا نموونەکە کو فیلەسۆفان دڤێن ل دویف شیانان لێ نێزیك بن. هوشیاری کرن (ادراك) رامانا وێ زانینه یان تێگەهشتنا بابەتێن هەستەکی یه وەکی دار و بار و خانی و پەرتووك.

گومان ڕامانا وێ نەباوەرییه نەبوونا مسۆگەریێ. (الیقین) و هندەك جاران گومان قوناغەکە ژ قوناغێن گەهشتنێ بو مسوگەریێ بۆ چوونا وی ژی دەست نیشانکرنا زانیارییە و دەستپێکه بۆ کارناسینێ کو ل داناپێدان ب نەفامیێ دەست پێدکەت هەتا دگەهیتە زانیاریا مسۆگەر.

## جۆرێن زانیاریا سەرەکی:

زانیاری جۆرا و جۆرن بتنێ دێ بەحسێ سێ جۆران کەین:

### ١- هەستزانی:

گوه بوون ودیتن و تام کرن وبیهێن هەمی هەستێن مەیێن جورا و جۆرن و ل تشتێن هویرییێن دۆرێن مه ئاگەهدار دکەت. گەلەك ژ فەیلەسۆفان هەستەکی گرنگ بڤێ زانیاریێ ددەن وب بناغه و ژێدەرێ سەرەکیێ زانیاریێ دهژمێرن ئانکو وەسا هزر دکەن و هەر چەندە زانیاری شێوێ ڕووت یان گشتی هەبیت پێدڤی یه هەر بزڤرینه ڤه سەر بنەڕەت و دەستپێکا وێ یان ب ڕێکا ئەزموونکاریا هەستەکێ

بەلێ هندەك ژ فیلەسۆفێن دی ئاگەهداریێ ژ کارتێکرنا هەستان ڕادگەهینن بهندێ کو مە شاش دکەن و دخاپینێن و جار جار ڕێکامە دگوهۆرن، بۆ ئەڤێ مەرەمێ وان نموونە ژی یێن وەکی شکەستنا شێوێ دارەکی کو دئێخنە دناڤ ئاڤێ دا ئەو سەرابا کو ل سەر ڕێکێ بەرچاڤ دکەڤیت.

## ٢- زانیاریا (ژیرمەندی):

هندەك ژ فەیلەسۆفان دبێژێن ژیری هەڤپشکە ل ناڤبەرا خەلکی و ب گەلەك کارێن هەمە جۆر ڕاددبیت وبێ ژیری زانیاری بەردەست نابیت. دبێژێن هەمی هۆش هەستان ڕێك دئێخیت ودئێخیتە بەرهەڤبەریێ وپێکڤە گرێددەت وب شێوەکێ ڕێك وان ڕێك دئێخیت. ئەنجام ژی ل دەسپێکێن هندەك ژ بابەت و زانیاریان دردئینیت وهندی دەرئەنجامێن ژیری و هزری وبیرکاری هەبن ئەو هەمی ئەنجامێ کارێ ژیری و هزری وبیرکاری نە. هەر هۆشەك ژی هەڤبەندیێ ناڤبەرا هزرێن جودا جودا پۆختە دکەت وەسا ژی دبینیت هۆش درێکا چالاکییاندا پشت ب زانیاریا مێشکێ دی یان زانیاریێن ئەزموونکاری گرێددەت بۆ نموونە کومەلزان کومەکا جودا جودا ژ ڕێکێن ئەزموونکاریێ تێبینی و ژیان ب ناڤ واندا دەست ب ڤەکۆلینێن خۆ دکەت وپاشی هەر ب ڕێکا ژیری ڤە هەمەجوری وجوداهی دناڤبەرا جڤاکان دا دەست ژ ڕاستیان بگەهیت هندەکێن دی هەنە دوێ باوەریێ دانە کو ئەزموونکاری بتنێ ب ڤان مەرەمان ڕاددبیت. ئەوا ئەڤرۆ کو بەلاڤە مرۆڤ خودان هۆشی وهەستە زێدەباری شیانێن ویێن دی کو خوادیێ مەزن پێ پەخشیە.

## ٣- پێمەسیانا تشتان (هەسپێکرنا تشتان): (الحدس)

ئەگەر هەست زاینێ پشت (هەسپێکرنا تشتان) ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ ب گرێددەت و . . . ئەگەر زانی ژی پشتی ب بەلاڤیێ ودەرئەنجامان گرێ ددەت دێ هوشیاریی (ادراك) پشت هەسپێکرنـــا تشتان ڕاستەو خۆ یان ب دەمێ ڕاستەڤینە

گرێدەت ل هەستکرن ب جوانییێ دچیت وەکی بێژی جۆرەکە ژ پێزانینان هونەری یان پارچەکا مسۆزیکی. هەسپێکرنا دەرویشان ژی کو هندەك جاران ب مفای وەردگرتن دهێنه ناڤ کرن ب رێکا هەست و دلی ل تشتان دکەن.

### ج- ڕادە و سنووری زانینی:

گەلەك ژ فیلەسوفان دان پێدانێ ب هندێ دکەن کو زانینا مرۆڤی یا سنووردارە فەیلەسۆفێن زانینێ تووشی ئاریشا ڕێژەیا زانیاریێ (نسبة المعرفة) سەبارەت بوان ڕاستێن کو دزانیت بووینە کو بەردەوام دکەڤیتە بەر کارتێکرنا بارێ دەورو بەو هەلۆیستێ مە یێ مرۆڤایەتی ژی گەلەك جاران هەمی ئەو زانیاریێن کو مە پێدڤی پێ هەی و دشیاندانینە بریارا ڤەبڕی ل سەر تشتان بدەین گەلەك جاران کارتێکرنا هزرۆ بۆچوونێن خەلکێ دی گەلەك ساناهی تڕە ئەگەر هاتوو پێدڤیێن ئەڤێ کارتێکرنێ بهێتە دابینکرن.

## (سێ): بابەتێن بهایان یان فەلسەفا بهایان (ئەکسیۆلۆژی)

بابەتێ بهایان یان فەلسەفا بهایان (ئەکسۆلوژی) مەرەم ژ (بهایان) هەڵسەنگاندنا تشتی وخەملاندنا وی یە، چ وەك شێواز ب دەستڤە ئینانا مەرەمێ یا نکو ئەو ب خۆ مەرەم بن. جۆرێ دوێ دکەڤیتە چوار چوڤێ ڤەکۆلینا بهایێ فەلسەفێ کو بۆ سێ تشتان برِیە (ڕاستی و چاکی وجوانی). ئەڤ بهایانە ب بهایێ خۆیەتی دهێنە ناڤ کرن بەرامبەر ب بهایێ دەرەکی، دهێتە دویر ئێخستن. بابەتێ چاکیا زانستی ڕەوشتە یان فەلسەفا ڕەوشتیە، بابەتێ جوانی زانستێ جوانی یە یان فەلسەفا جوانییێ یە (فەلسەفا جوانی) ژی ژبەر وێ ب خۆ ژی گرنگیا وێ ل بەراهیێ دهێتە دانان بەلێ بابەتێ ڕاستیا زانستێ (لۆژیك)ە.

## ١- فەلسەفا ڕەوشتی:

(ڕەوشت ناسی) یان فەلسەفا ڕەوشتی زانستەکە و وان مەرجان دادنیت کو پێدڤییە دکریارێن مرۆڤیدا هەبن داکۆ ببیتە بابەتەك ژبۆ پیڤەرێن ڕەوشتێ یێن مە لدۆر وان کریاران، یان ئەو زانستە کو نموونا هەرە بلند ددانیت کو دڤێت ڕەفتارا مرۆڤی لگۆر وێ پەیرەو بکەت ئانکو زانستەکێ پیڤانەیییە ئانکو ڤەکۆلینێ لدۆر ڕەفتارو سەرەدەرییا مرۆڤی کۆ پێدڤییە یا چاوا بیت؟ کێشێن ئەڤی زانستی ئەڤان ڤەدگریت:

أ- ڕاستی و ڕەسەنییا هەستێ ڕەوشتێن مە.

ب- ئەو پاڵدەرێن وەلمە دکەن کو هەستێن ڕەوشتێن خۆ بجە بینین.

ج- مەرەم و ئەنجامێن داوییێ کو بکارن ڕەوشتێن خۆ مە دڤێت بگەهینین.

د- ئەو پیڤەرێن ئەم بکاردئینین بۆ پیڤانا کارێن خۆ وحوکمی لسەر دادنین ب باشی یان ب خرابی.

ب کورتی ڕەوشتناس درێکەفتی نیت لسەر خورستێ بیرو باوەرو بهایێن ڕەوشتێ، هندەك ژوان دبێژن مرۆڤێ یێن دانایێن لگۆر چەند بنەمایەکێن زانیاری وەرارکریە ولبەراهیێ لسەر مفای و بەرژەوەندیا خۆیەتی هاتییە دامەزراندن و پاشی بۆیە بنەمایەکێ مفایێ گشتی ولداوییێ بشێوەیەکێ هزرو بیرێن ڕەوشتەکێ بنەجە ودارشتی بیێ کو دەستکاری تێدا بهێتە کرن.

## ٢- فەلسەفا یاسایێ:

هندەك ژ ڤەکۆلەران یاسا کریە تایەکێ فەلسەفێ، لبەراهیێ پشکەکا فەلسەفا ڕەوشتی بوویە، پاشی د ڤەکۆلینا ئەوێ هەڤبەندییا پاشکۆیەکێ ڤەکۆلینێن ڕەوشتی. هزرا دادوەرییێ کو یاسایێن دەولەتێ دیار دکەن، جودایە دگەل هزرا

ڕەوشتییٚ کو ژ خورستی دهێت یان ژێر (عقل) دسەپینیت. بەلێ دادوەریا یاسایی د فەلسەفا یاساییٚ دا کومەکا یاسان کو دەولەت بسەر ئاکنجییێن خۆ دسەپینیت. (کانت)ی یاسایا کریاریٚ ژ یاسایا رەوشتی جوداکریە. ئانکو فەلسەفە یاسایی ژ فەلسەفا رەوشتی جوداکریە، چونکی ئەم دیاسایاندا گرنگییٚ ددەینە دیاری (بسەرڤە) (الظاهر)، بۆ نموونە پەیڕەوکرنا یاساییٚ ب کریارا یان ب مارەکیٚ دیار، هەڤبەندی ب مەرەما ڤە (النیات) نینە ئەگەر بهێت وببیتە ئەگەریٚ کریارەکا دیار، ژبەرکو دەولەت کەسیٚ سزا نادەت لسەر ئەوا ددەروونیٚ ویدا هەی چ هزرکرنا تاوانیٚ (گونەهیٚ) بیت یان مەرەما باشی و خرابییٚ بیت، فەلسەفا یاساییٚ گرنگییەکا ئێکسەر ب ڕاستییێن پشکێن یاساییٚ نادەت، بەلکو پویتەی ب دەسپێکییێن بنچینەی ددەت کو زانایێن یاسایی وەسا ددانن، وئەو بیردۆزێن گشتی ژی کو یاسا ناسیٚ تایبەت دادنیت. دشیاندایە کێشێن فەلسەفا یاساییٚ بڤی شێوەی کورت بکەین:

أ- فەلسەفا یاساییٚ ژ زانیاری و لوژیکیٚ ڤەدکولیت کو یاسا ناسی پەیرەو دکەت، دبێژنە وان تێگەهێن گشتی ژی کو د زانستیٚ یاسا دانانیٚ و یێن دیدا دهێنە بکارئینان وکو دشیاندا نینە ژ زانستیٚ پشکەییدا بهێنە دیارکرن، وەکی تێگەهێن: (کریار) و (نییەت) و (ئیرادە) و (مەرەم) و ئەنقەسد) و (ئەگەر) و ڕامانا (یاساییٚ). ب خۆ (ئازادی و هەلبژاردن). هەروەسا ڤەکۆلینا لوژیکیٚ ئەو بەرنامەیە کو زانا و یاسا دانەر پەیرەو دکەن، ژ ئەرکیٚ فەلسەفا یاساییٚ یە.

ب- ڤەکۆلینا ئەو تێگەهێن سەرەکی یێن کو یاسا ناس بکاردئینیت و جودا ژ زانستێن دی کو تایبەتن ب ویڤە، وەکی تێگەهێن: (دادوەری) و (سزا)، (لدویڤدا هاتن - التبعیة) و (کەساتی) و (مولکداری).

ج- ڤەکۆلینا بیردۆزێن گشتییێن یاسایی: بۆ نموونە مەرەم ژ سزادانیٚ چییە؟ هندەکا گوتییە مەرەم ژێ ڕاگرتنە، و یێن دی گوتییە چاککرنە، کەسێن دی

گوتییە مەرەم ژ وێ سزایە. هەروەسا دادوەری چیە؟ د ڤێرەدا دوو بیردۆز هەنە:

**بیردۆزا ئێکێ:** بنچینە یا دادوەریێ بۆ بەرهەڤیا خورستی یا نبۆ تێگەهێ (ئازادیا کەساتی) ڤەدگەرینیت.

**بیردۆزا دووێ:** دبێژیت دادوەری چەند ڕێسا یەکێن رەفتارێ نە وجۆرە سزایە وان دپارێزیت، دیرۆك لدویف بارۆدۆخێ وان دروست دکەت. ڕێسایێن ڕەفتارێ گەشە کرینە و ژیر یان نێرینا پوخت ژێدەرێن وێ نینن! دیرۆك ژێدەرێن وێنە.

**٣- جواننـاسی:** بابەتەکە ژ بابەتێن فەلسەفێ سروشتێ جوانیێ و بابەتێن وێ ڤەدکۆلیت، دیسان ئەو کێشێن کود بن سیبەرا رامانێن سروشتی وبابەتێن جوانی وهونەری ئەم تووش دبینێ، چارەسەر دکەت.

## أ- جوانی و بهایێن جوانیێ:

جواننـاسی جوانیێ ڤەدکۆلیت وتێگەهێن جوانیێ شرۆڤە دکەت و بەحسێ بهایێن جوانیێ وەك سادەیی وبەژن و باڵ و رێکو پێکیێ دکەت، دیسان هەر ب شرۆڤەکرنێ بابەتێن جوانیا سروشتی دئێخیتە بەر ڤەکۆلینێ وەکی وێنێ دارەکێ برەخ رووبارەکی ڤە هەروەسا ئاماژە ب بابەتێن هونەری ژی دکەت وەکی پەیکەرێ (شەهرەزاد - شەهرەیار ) و پەیکەرێ سەربەستی و لایەنێن وان یێن جوان دیار دکەت. بهایێن جوانیێ بڤان جۆرانە:

أ- شێوێ وێ یێ ب هەڤبەندیێن دناڤبەرا رەگەزێن وی بابەتیڤە گرێداینە.

ب- ماددییە، ئانکو ئەو ماددەیێ کو بابەتێ وێ ژێ پێکدهێت.

ج- دەربڕینە، یا گرێدایە ب وان رامانێن کو بابەتێ وێ دەردبڕیت.

هەلبەستەکێ بکەینە نموونە دێ شێوێ خۆیێ وێنەیی د کێشا خۆدا دیارکەت بەلێ لایەنێ ماددی دێ دپەیف وگوتنێن گۆهلیبووی و داهێنە خواندن دا دیاربن، لایەنێ سییێ (لایەنێ دەربڕینێ) ب بیرو باوەر و ڕامانێن وێ دیار دبیت. جواننـاسی

ئەزموونا جوانیا بەهرەیا هونەرمەندان ڤەدگریت ئەڤ شرۆڤەکرنە ژی بتنێ وێژە و هونەری ناڤەگریت بەلکو ژێ دەربازدبیت و هزرو فەلسەفێ و زانستی و بەلکو هەر نێرینەك و بیردۆزەکا نۆییا هەر بەرنامەکێ تازە و هەر کارەکێ ب دەروونەکێ روون بهێتە ئەنجامدان دبیتە نویکاری و زێدەباری و داهێنانەکا نووی، ئانکو جوانناسی ئەو زانستە کو ل هەستان هەستپێکرن وئەوان خۆشییان ڤەدکۆلیت ل دیمەنێ تشتێن جوان پێکدئینن، ئەوان ئاستانژی دادنیت کو تشتێ جوان پێ دهێتە پیڤان، ئانکو ڤەکولینا هندێ دکەت کا تشتێ جوان ویێ کرێتییێ دڤێت یێ چاوابیت؟ ئانکو جوانناسی ل جوانی وکرێتییێ ڤەدکۆلیت. جوانناسی ئەڤان کێشان چارەسەردکەت.

١- ئەرێ جوانی بابەتییە یان خۆیەتیە، یان ژ چ هەست ب جوانییێ دهێتە کرن ئانکو سروشتێ جوانییێ چیە؟

٢- پێڤەرێن جوانییێ، یان چاوا وب چ جوانییێ جودا دکەین.

٣- هەڤبەندی دناڤبەرا هونەری وڕەوشتی، یان دناڤبەرا جوانی وباشی یان دناڤبەرا جوانییێ و باشییێ.

٤- ڕۆلێ هونەران دچاڤلێکرنا سروشتی دا یان ل دەرکەفتن ژ دوور هێلی.

٥- ژێدەرێ شرۆڤەکاریا هونەری و، بیردۆزێن شێوەیی.

٦- پۆختە و ڕوونکرن. پەیڤەکا کورت و ڕوون دەربارەی وان:

**١- جوانی بابەتییە یا خۆیەتیە، یان سروشتێ جوانییێ چیە؟**

ژ چ هەست ب جوانییێ دکەی؟ ئەرێ ئەو ب خۆ هەیە؟ یان هەستکرن ب جوانییێ یا ب هندێ ڤەگرێدایە؟ چ ژ وی تشتی ئەم دبینین وچاوا ئەو تشت لبەر چاڤێن مە دکەڤیت؟ دڤێرەدا گەلەك بۆچوون هەنە، گرنگترین ژ وان دوو خاندنگەهن: یا ئێکێ جوانییێ ب سالوخەت یان ب تایبەتمەندیا بابەتی دادنیت کو د تشتێن جواندا

هەنە و، سەر بخۆنە ژ وی ژێرێ کو پێ دزانیت، وەسانینە کو تشت نەدبوون. ئانکو جوانی د تشتاندا هەیە ئەگەر ژیر نەبیت ژی پێ بزانیت. بەلێ خواندنگەها دووێ جوانییێ ب هەبوونەکا بابەتی دادنیت، بەلکو بوچ ئەوان هێزان ڤەدگەرینیت یێن دزانن، جوانی لدەف وێ ڕامانەکا ژیری. ب خۆ بۆ تشتەکێ نینە کو دتشتێ جواندا بیت و سەربخۆ ژ هەر پێزانینەکێ. خواندنگەها ئێکێ جوانییێ بێ سنوور دادنیت.

**٢- پیڤەرێن جوانییێ**، یان چاوا و ب چ جوانییێ جوداکەین؟ یان هەڵسەنگاندنا جوانییێ: هەلسەنگاندنا جوانییێ: ئەو شیانە کو بڕێکا وی جوانییێ جودا دکەین ودهەلسەنگینین دبێژنێ (تام). ب وێ جوانییێ مرۆڤ برێکا وێ هەست ب خۆشیا جوانییێ دکەت و، ب پلێن جودا لدەف کەسان هەیە، پەروەردەو ژیان ب پلێن جودا ل کەسەکی و کۆمەکێ بلند دکەن. دەنگەك یان دیمەنەك بئێك شێوە کار ل گوهداری وبینەری ناکەت: ئەگەرێ ڤێژی:

**ئێك:** پیکهاتنا فاسولکان د هەمی کەساندا وەکی ئێك نینە، ژبلی جوداهییێ دناڤبەرا کەسان ژ روویێ سروشتی و پەروەردێ وتیتالانڤە.

**دوو:** جوداهیا پلا ژیری وهەستان بتنێ ژ بۆ پێزانینا لڤین و شێوە و دەنگ و ڕەنگی کارناکەن، بەلکۆ هش و هزرو بیرا ژی پێکڤە گرێددەت و ڕێکدئێخیت و، هەڤبەندیێن وان دزانیت. ئەڤەژی نهێنیا وێ حەزا مرۆڤێن بەراهییێنە ژ ڕەنگێن تاری (گران)، ب بەروڤاژیا ئەوێ حەزو ئارەزووکرنا رەنگێ ڤەکری (سڤك) لدەف شارستانیان. دو قوتابخانێن هەلسەنگاندنا جوانیی هەنە: بۆچی تامێ ژ جوانییێ وەردگرین، ئەرێ ژبۆ ژیری یان ژبۆ وژدان و سۆزێ ڤەدگریت. قوتابخانا ژیری و یاسا یان ب پێدڤی دادنیت. بەلێ قوتابخانا رێسا و ژیری ویاسان ب پێدڤی بۆ هەر شیانەکا مە ڤەدگەرینیت. بەلێ قوتابخانا (ڕۆمانسی) و سۆزداری تۆخمێ سۆزێ

یان وژدانێ دووپات دکەت ژ تام وەرگرتنا جوانییێ و دان پێدانێ ب شیانێن رێسایان ناکەت ژبۆ (دروستکرنا هونەرێ بلیمەتی)، سەپاندنا جوانییێ ب بۆچوونا قوتابخانا ئێکێ ژیراتی و پوختە و، د سەپاندنا داکەفتیێن دیدا کو پەسنا دیاردان دکەت جودا نینە بەلێ قوتابخانا سۆزاداری ڕۆلێ ژیری کێم دکەت. چونکی سەپاندنا جوانییێ یان هەڵسەنگاندنا جوانیا پۆخت وژدانە ب جوانییێ یان هەستپێکرنە یان دەرفەت ئینانەکا ئێکسەرە دەربارەی تشتێن جوان.

**٣- هۆنەر و ڕەوشتناسی:** دوو بۆچونییێن دیار هەنە: یا وەسا هەیە کو ئارمانجا هۆنەری ب ئارمانجا رەوشتی دادنیت، بڤی شێوی (باشی) و (جوانی) وەکهەڤ دکەت و، ب ئەرگێ هونەری دزانیت کو خزمەتا ڕەوشتی بکەت. بەرۆڤاژی ئەڤێ بۆچوون هەیە گۆتیە هونەر جوانییێ ڤەدکۆلیت و، چ دی لدویڤدا نینە، یا گرنگ جوانی شێوێ هونەری یە، یان (ئەو شێوە) یە، بەلێ بابەت هەر تشتەکێ بیت قەیدی ناکەت، خراپ بیت یان تاوان بیت یان ژی باشی بیت.

**٤- هونەر مەیدانا دەربڕینا جوانییێ یە:** سروشتی جوانی تێدایە، بەلێ هونەر ئەو شێوازن کو مرۆڤ ب وان دەربرینێ ل جوانییێ و هەستکرن ب جوانییێ دکەت. د ڤێرەدا گیروگرفتەك دەردکەڤیت: ڕۆلێ هونەرمەندی چییە: ئەرێ پۆخت وچاڤلێکەرە و زارڤەکەرە ژبۆ رەنگڤەدانا جوانیا سروشتی، یان رۆلێ وی زێدەباری جوانییێ ودەربڕینێ ل تشتی کو د شیانێن ویدا نەکو بتنێ کو ئەو گیاندارەکە. د ڤێرەدا چەند ڕێباوەر هەنە:

**أ- ڕێباوەرا (مذهب) نموونەیی د هونەریدا:** لگۆر ئەڤێ ڕێباوەرێ هونەرمەند دڤێت وەکو لسەر وی پێدڤی وەسا دەربڕینێ لکاربێت خۆ بکەت، وژدان و سۆزا خۆ بۆ هونەرێ خۆ تەرخان بکەت، هەر ب ڤەگوهاستنا ڕاستییان وەك خۆ یان لدویڤ

سروشتی و جوانیا وی وەکو هەی نەڕاوەستیت. هەر تشتەك ژی خراب و پیچ بیت د بیاڤێ دەربڕینا هونەریدا دویربێخیت.

**ب- ڕێباوەرا سروشتی:** ئەڤ ڕێباوەرە وەسا دبینیت کو بتنێ سروشت بیاڤێ هونەرییە، لسەر هونەرمەندی یە چەند دشێن چاڤ لسروشتی بکەت، تێبینی بکەت و هەر ڕاستیەکا وییا ڤەشارتی پشت گوه بێخیت، جەوهەرێ یان چاواتییێ دویر بێخیت و ژ داکەفتیێن دیمەنێن سروشتی دەربازنەبیت ژ ب سەپاندنا تشتان بسەروان یان ژلایێ خۆڤە تشتی بێخیتە سەر. رێباوەرا سروشتی باوەریێ ب بابەتییا جوانییێ سروشتە، لەورا ئەڤ رێباوەرە ژدەستێوەردانا هونەرمەندی کێم دکەت، بەرۆڤاژی رێباوەرا (رۆمانسی).

**ج- ڕێباوەرا (ڕومانسی):** ئەڤ ڕێباوەرە ل داویێن سەدێ هەژدێ و پشتی هنگی پەیدابوویە، داکوکیێ ل لایەنێ سۆزو هەست و وژدان و تێگەهشتنا راستە وخۆیا سروشتی وجوانیا وی دکەت، ژ رۆلێ ژیری کێم دکەت، باوەریا وێ وەسایە کو هونەرمەند رۆلەکێ گرنگ د زانینا جوانییێ یان دەربڕینا وێدا هەیە، ژبەر ڤێ ب پێدڤی دهێتە زانین دەست بێختە ناڤ سروشتی نەبەس ژێ ب ڤەگوهێزیت. ئەڤ ڕێباوەرە کارێ ڕاستگۆییێ ل دەربرین و ل خۆیەتی وئاشۆپ و سۆزو ترانەپێکرنێ ب ژیرێ لوژیکا وی، ب مەزن دادنیت. لدەف وێ هونەر مەندی پێدڤییە ئازادییەکا تەمام یا دەربڕینێ هەبیت بێی گوە بدەتە تشتەکی یان خۆ ب ئاستەنگەکێ ڤەگرێدەت وەك ڕێسا بۆ کارێ هونەری و ژ ڤان شێوەیان.

## ٤- لوژیك (المنطق):

ئەگەر بابەتێ فەلسەفا ڕەوشتی باشی بیت وجوانی فەلسەڤا جوانییێ بیت، بابەتێ لۆژیکێ ڕاستی و دروستییە. لوژیك هاتییە ناساندن کو زانستێ هزرکرنا

ڕاستە، یان زانستی یاسایا هزرێ یە، بابەتێ وێ هزرێ هەر چ بیت. ئەڤ ناساندنە لگۆر لۆژیکێ کارەکێ ڕاستە، ئەو لۆژیکا کو (ئەرستۆ)ی بنچینێن وێ داناین وەتا دەرکەفتنا جۆرێن لۆژیکا نوی یا بەربەلاڤبوو. لوژیکناسێن نوی نابێژن لۆژیکا زانستی هزرکرن نینە کو ڕاست و خەلەتیێ ژێك جودا دکەت، بەلێ بەرنامێ ئەزموونکاریێ دایە دگەلدا، ژبەر ئەڤێ لدەڤ وان بوویە زانستەکێ ستایشانە (مەدح)، بەلێ لدەڤ یێن بەراهیێ زانستەکێ پیڤانەیی بوو، ئانکو ئەو ڤەکۆلین دەربارەی هزرکرنا ڕاست دڤێت یا چاوابیت. لەورا یێن بەراهیێ ب زانستەکێ پیڤانەیی دانایە ئانکو ئەڤە پیڤەرە یان ترازیە یانژی ساخکەرێ هزرێ یە، هزرناسێن بەراهیێ لۆژیك ب ئامرازو دەرازینەکا زانستێن خۆ دانا بوو، نهۆ دپرانیا تەوەرێن فەلسەفیێن نویدا دکالکا فەلسەفێ دایە، لۆژیکا کەڤن ب (وێنەیی) هاتیە ناڤکرن، چونکی بابەتەکە وێنی زانستی وەرگرتییە نەك بابەت ب خۆ. بەلێ یاسایێن هزرکرنێ لگۆر لۆژیکا کەڤن سێ نە:

**ئێك:** یاسا یان بیروباوەرێ خۆیەتی و ڕامانا وێ ئەوە کو هەر تشتەك هەر ئەوە، ب دەربڕینەکا دی ئەو تشت هەر ئەو بخۆیە (ئەلف ئەلفە).

**دوو:** ژ یا ئێکێ دەسپێکا یا دووێ دهێتە وەرگرتن (دەسپێك نەیا بەروڤاژییە) تشتەك نەشێت ئەو بیت و ئەو نەبیت دهەماندەمدا (ئەلف نەئەلف نینە) (هەبوون هەبوون نینە) یان (زێدە زێدە نینە).

**سێ:** دەسپێکا ژناڤبری: تشتەك یا ندێ بیت یان نابیت (یان ئەلیفە یان ئەلیف نینە) یان زێندی نەشێت دهەماندەمدا یێ زێندبیت و یێ مری ژبیت د هەماندەمدا دیاردبیت یان دیار نەیبت. ئەڤجا بەر هندێ کو بابەتێ لوژیکێ کریارێن ژیرینە ژ ڕوویێ دروستی و نە دروستیێ ڤە، کریارێن ژیری ژی سێنە و پێکهاتینە ژ: شێوەکرن، پەسەندکرن یان سەپاندن، گرۆڤەئینان، لوژیك

ڕامانا ئەڤان سێ پشکان دبەخشیت:

**١- شێوەکرن:** زانینا ڕاستیا تشتی بێی سەپاندنا بۆچوونان ب سەر وان ب ئە یان نە، کو ڤەکۆلینا پەیڤان ل ڕوویێ چاوانی و ناساندنا وان ڤەدگریت.

**٢- پەسەندکرن یان سەپاندنا هەبوونا هزرێ:** دگەل داکەفتیدا و سەپاندنا بۆچوونێ لسەر ب راست دانانا وێ یان ب درەو دەرئێخستنا وێ، جۆرەها کێشە تێدا دهێنە ریزکرن. ئەڤجا ژبەر هندێ کو بابەتێ لۆژێکی کریارێن ژیری نە ژ روویێ دروستی و نە دروستییێ ڤە.

**٣- گروڤە ئینان:** ڤەگوهاستنا ژیریە ژ وان کێشێن کو هاتینە سەپاندن بۆ یێن دی کو ژوان هاتیە وەرگرتن، ئانکو ئەنجام دەرئینانا نەهاتیە زانین ژ هاتیە زانین کو: یان گرۆڤە ئینانا ڕاستەوخۆیە، وەك دەرئینانا ئەنجامێ: هندەك ئەفریقی (مەغربی)نە ژهندێ کو هەر مەغربی یەکژی ئەفریقییە. یان گرۆڤە ئینان نەڕاستەوخۆیە ئەڤ دوماهی پیڤانە، دڤێت دناڤبەرا واندا هەبیت وەکی بێژن: (هەر مرۆڤەك نامینیت و سۆکرات مرۆڤە، ئانکو سۆکرات نامینیت).

ئارمانجا لۆژیکێ ڤەدیتنا راستیێ نینە، ئەڤجا ئەڤ راستییە بیرکاری بیت یان فیزیاوی و دیرۆکی ودەروونی و جڤاکی بیت، ئەڤە ئەرکێ زانا وبسپۆرێن هەر زانستەکی ژ وان زانستانە. هەر زانستەکی شێواز و بەرنامێ خۆ هەیە، ئەوا جهێ گرنگیا لوژیکناسی بیت زانینا ئەوان مەرجانە کو وەلێکریە ڕاستی یا ئاشکرابیت. ژ ڤی روویڤە زانیاریا لوژیکی سێ سالۆخەت وتایبەتمەندی هەنە:

**ئێك:** لوژیك (المنطق) جۆرەکی زانیاریا شرۆڤەکارییە: ئانکو زانیارییا ژ زانینا ڕاستیێ بۆ زانینا مەرجیێن وێ بلند دبیت.

**دوو:** لۆژیك جۆرەكێ زانیارییا رەخنە گرییە: هەول ددەت راستی ونەڕاستیێ ب وان مەرجان ژێك جودابكەت ودەربێخیت كیژوان هویرترن بۆ گەهشتنا ڕاستیێ و دەربڕینا وێ.

**سێ:** لۆژیك جۆرەكی زانیارییا پیڤانەییە یان یا بهایە، نە ڤەكۆلینێ ل هزركرنێ دكەت وەكو هەی و نە ل داكەفتیان ژی ڤەدكۆلیت هەر وەكی هەنە، بەلكو ل هزرا ڕاست و دروست ڤەدكۆلیت، ئانكو هزر دڤێت یا چاوابیت و د چارچۆڤێ ئەوان مەرجێن كو وەلێ دكەن دگەل خۆ و دگەل داكەفتیدا گونجای تر بیت. دڤێرەدا لۆژیكناسی دگەل دەروونناسی و دیرۆكناسی وسروشتناسی جودا دبیت، ژ روویێ هندێ كو ئەو ل داكەفتێن دەروونی و دیرۆكی و سرۆشتی ڤەدكۆلن وەك خۆ كا چاوان هەنە نەكو وەك كو دڤێت وەسا بن یان وەسا روویبدەن. بەلێ كارێ لوژیكناسی دویڤچوونا ئەوان پێنگاڤێن هزرینە كو هەر ئێك ژوان ژبۆ گەهشتنا وان بۆ راستیێ پەیڕەو كرینە.

**٤- فەلسەفا زانستی:** ژبەركو فەلسەفا زانستی ژئەنجامێن وەراربوونا زانستێن سەردەمێ نوی بوویە، فەیلەسۆفان هەولداینە، پویتەی ب زانستان بدەن ژ روویێ بەرنامە و لوژێكێ ڤە ڤەكۆلن، پێكهاتن و دامەزراندنا بیردۆزا زانستی پێشچاڤ بكەن و شرۆڤە بكەن. فەلسەفە هەر ژكەڤن وەرە گرنگی ب زانیاریێن زانستێ دایە و پڕانیا فەیلەسۆفێن ئێكێ زانا بوون و لسەر دەمێ ڕابوونێ و گەشەكرنێ شرۆڤەكرنێن زانستی ئێكسەر كاركریە سەر تەوەرێن فەلسەفی، بۆ نموونە هەر وەكی د فیزیایا نیوتن دا ڕوویدایە، یان هەر وەكی ل ڤەدیتنێن نۆیێن گەردیلان و دامەزراندنا واندا ڕوویدایە و ڕووی ددەت. فەلسەفا زانستی تایبەتمەندییەكا گرنگە ژ تایبەتمەندیێن فەلسەفێ كو فەیلەسۆف و زانا نەشێن دەستان ژێ بەردەن.

ب شێوەکی سادە ئەوە کو فەلسەفا زانستی فەلسەفەکرنە دەربارەی زانستی پاشی فەلسەفا زانستێ هەر فەلسەفەك یان فەلسەفەکرنەك دەربارەی زانستی یان لایەنەك ژ لایەنێن وێ ڤەدگریت. بۆ نموونە ئەوێ مژویلی فەلسەفا زانستی. بۆ هەیە مژویلی لایەنێن میتا فیزیکیێن (هەڤبەندی ب چاواوتی یا لپشتێ سروشتی هەیە) زانستی بیت. ئانکو فەیلەسۆفێ زانستی چ دشێت دامەزرینیت دەربارەی شێوەکرنەکا زانستێ گەردوونی یان کەرەستە یان ژیان ددامەزراندنەکێدا کو هەڤبەندی ب بنیاتێ گەردوونی وسروشتی و ئەگەر و مەرەمێن وی بیت.

فەیلەسوفێ زانستی بۆ وی هەیە مژویلی بنیاتێن زانیارییێن زانستی بیت و ل زانیاریان ڤەکولیت و، ئەرێ دشیاندایە ب رێکا زانستی و ئامرازێن وی پێ بگەهین؟

## هەر چاوا بیت کارکرن د فەلسەفا زانستی دا دوو مەرج هەنە :

**ئێك:** فەیلەسۆفێ زانستی دڤێت بەرێخودانەکا فەلسەفی یان فەلسەفەکا پەسەند کری بیت دەربارەی ئەرکێن خودان بەرنامە بیت بشێوەکێ کو خستەڕوویا زانستان لسەر بنیاتێ نوێ لێکبدەت.

**دوو:** فەیلەسۆفێ زانستی دڤێت زانستی بزانیت کو زانست بابەتێ ڤەکۆلینا فەلسەفێ یە وکەرستێ خاڤێ وێ کو لسەر وان فەلسەفە دهێتە دارشتن، ئانکو دڤێت ئاگەهداربیت دەربارەی ئەوا د زانستیدا ڕووی ددەت و گرنگترین بیردۆزێن زانستی و ڤەدیتنێن وی وتێگەهێن وی بزانن.

### ٥- فەلسەفا دیرۆکیێ:

گرنگیێ ب لێکدانەڤەیا تێکرایی دیرۆکا مرۆڤایەتیێ ددەت لسەر بنیاتێ بیردۆزەکا فەلسەفا گشتی، دشیاندایە وەکو نموونا ڕوونکرنێ بەحسێ بیردۆزا

(پێشکەفتنێ) کو د سەدێ هەژدێدا جهێ بیردۆزا (ئوکستین)ی گرتییە و (ڤیکۆ) نوینەرێ وێ بوو کود گوت پێشکەفتنا ژیری یا مرۆڤی سێ قوناغ هەنە کو پشتی هنگی ئەگست کۆنت پێشڤەبر و گوتی هەمی مرۆڤاتی ب سێ قوناغان دا دەربازبوویە و ئەڤە: قوناغا ئەڤسانەیی و قوناغا فەلسەفی (یان میتا فیزیکی) و دووماهیا وانژی قوناغا زانستی یە. یا ئێکێ بەری فەلسەفا یۆنانی بوویە، یا دووێ ژ فەلسەفا یۆنانی وەرە هەتا داوییا سەدێ هەژدێ کو قوناغا زانستی ژ دەسپێکا سەدێ نوزدێ دەست پێدکەت هەتا پشتی هنگی، نموونا سیێ دیرۆکا مرۆڤاتییێ لسەر بنیاتێ هۆکارێن دەوروبەر یان باشی و گەلەکییا خوارنێ لێکدەتەڤە کو (تۆماس بیکل) گوتییە نموونا چوارێ لێکدانەڤەیا دیرۆکێ یە لسەر بنەمایێن دەوروبەرو ئابوری و جڤاکی و دەروونی پێکڤە، هەروەکی (ئبن خەلدوونی). هەروەسا فەلسەفا دیرۆکێ بنیاتەکێ فەلسەفێ بۆ زانستێ دیرۆکێ دادنیت ب پۆختەکرنا ئەوی بەرنامێ کو دیرۆکنڤیسی ددانن چ ئەزموونکاری بیت یان دەرئینانەیی بین! داخۆیانی ل ژێدەرێن دیرۆکی وشرۆڤەکرنا وان، ڤەکۆلینان ئەو زاراڤێن گشتییێن کو دیرۆکنڤێسن بکاردئینن دهێنە دان وەکی ئەگەرێن وان و سەپاندن ویاسا و یێن دی.

فەلسەفا دیرۆکێ هەر گرنگییێ ب خستەروویا داکەفتیان نادەت! بەلکو وەسا دبینیت کو مرۆڤاتی لگۆر یاسا یا بنەجه برێڤە دچیت و ژ سەردەم وجهان دەربازدبیت و لدویف حەزو ڕێکەفتان برێڤە ناچیت، ل بەراهیێ ئەرکێ فەلسەفا دیرۆکێ یە ئەوان یاسایان ڤەبینیت کو دیرۆکا مرۆڤاتییێ لێکدەتەڤە. بناڤودەنگترین فەیلەسۆفێن دیرۆکی: ئۆکستین و ئبن خەلدوون و ڤیکۆ وهێردەر و هیگل و سپینسەر و ئۆگست کۆنت و مارکسی و توینبی و کەسێن دی.

## ٦- فەلسەفا ئایینی:

د ڤێرەدا دڤێت فەلسەفا ئایین و لاهوتی ژێك جودا بکەین، ئەوا دووێ ژ فەلسەفا ڤی ئایینی یا دیارکریە یان ئەوێ ڤەدکۆلیت (بۆ نموونە ئاخفتن ناسێ کریستییان و ئاخفتن ناسێ ئیسلامی). هندی فەلسەفا ئاینییە گرنگییێ ب ڕەخنە و شرۆڤەکرنا ئەو تێگەهێن گشتی ددەت کو (لاهوت) و (ئەدیان) ب کاردئینن. ئەگەر (لاهوت) هەول بدەت بەرگیریێ ژ باوەری پێکرنا ڤی ئایینی یان یێن دی بکەت ب گرۆڤ وپرسیاران، فەلسەفا ئایینی بۆ ڤێ مەرەمێ یا دیارکری نینە، بەلکو ب شێوەکێ ڕەخنە گرتییانە ل دیاردێن گشتییێن دینداریێ وئەڤ تێگەهێن گشتی ڤەدکۆلیت کۆ زانستێن تایبەتییێن (لاهوت) ب کاردئینن. وەك تێگەهێ هاتنا خوارا سروشتی (وەحی) و هەلگەرانەوە ژ پەرستنێ و بجه هێلانا ئایینی یان ژێ دەرکەفتن.

فەلسەفا ئایینی درابردودا پشکەك ژ (میتا فیزیك) بوو، پاشی ژێ جودایە بوویە. دسالێن داویێدا سێ ئاکارێن گرنگ دەست دایە ب ڤەکۆلینا فەلسەفا ئایینی: ئاکارێ دیرۆکی مەرەما وێ ڤەکۆلینا بنە جها ئایینی وپێشڤەچوونا هزرا ئایینیە. ئاکارێ دەروونی یێ زانیارییان کۆ مەرەما وێ بەرچاڤ کرنا ئەو بارێ دەروونییە کۆ ژیانا ئایینی ل سەردا دهێتە دامەزراندن، ئاکارێ فەلسەفەیی کو ئەرکێ وێ داخازکرنا وان گروڤان بوو کو بیردۆزو و بیر و باوەرێن ئایینی دیاردکەن.

## پرسیارێن پشکا سیێ

پ ١/ بابەتێن سەرەکیێن فەلسەفێ چنە؟

پ ٢/ مەرەم ژ بابەتێ (هەبوونێ) چییە؟

پ ٣/ بیردۆزا زانیاری چییە؟

پ ٤/ مەرەم ژ زانیاریا هەستی وزانیاریا ژیری چییە؟

پ ٥/ دەربارەێ هەستێن خاپینەر نموونەیەکێ بینە، ئەرێ ئەو وەل تە دکەت ب تەمامی پشت ب هەستێن تە ب گرێدەت؟

پ ٦/ مەرەم ژ فەلسەفا بهایان چییە ولقێن وێ ژی کیژن؟ بەحسێ ئێکێ ژ وان بکە.

پ ٧/ ل سەر فەلسەفا جوانییێ باخڤە؟

پ ٨/ ئەو بیردۆز چنە کو ڤەکولینێ ل سەر شیانکاریا هونەری دکەن؟

پ ٩/ مەرەم ژ فەلسەفا دیرۆکی چییە؟

پ ١٠/ لوژیك (المنطق) پێناسە بکە و ناساندنا وی ژی شرۆڤە بکە و گرنگییا وی ژی ڕوون بکە.

پ ١١/ مەرەما ژ فەلسەفا یاساییێ چییە؟

پ ١٢/ مەرەم ژ فەلسەفا زانستی چییە؟

پ ١٣/ جوداهی دناڤبەرا فەلسەفا ئایین و لاهوتی چییە؟

پ ١٤/ میتا فیزیك چییە و گرنگترین خاندنگەهێن وێ ژی کیژن؟

## پشکا چواریّ

# خستەرِوویا دیرۆکا فەلسەفیّ د شارستانییّن کەڤندا :

### دەسپیّکیّ :

### گرنگییا دیرۆکا فەلسەفیّ :

دیرۆکا فەلسەفیّ چەوانیا شێوێن هزرا بیردوزی و گۆتارێن ویّ و ڕێبازێن و یێن زانستی زانیارییان بۆ مە دابین دکەت. هەروەسا فێریّ ڕێبازا دروستا هزرکرنیّ وب کارئینانا ڤان زانیارییان دکەت بۆ گوهۆرینا جیهانیّ. ئێك ژ هزرڤانان دبێژیت: ((هزرکرنا بیردۆزی تایبەتیا سرۆشتی یە بەلیّ بتنیّ ب شێویّ خۆیەتی یان ئامادەیی خۆیەتی پێدڤی یە گرنگی پیّ بهێتە دان و، هەتا کو نهوو ژی چ هویەك نینە بۆ ویّ، بتنیّ ڤەکولینا هەمی فەلسەفا چوویی نەبیت)) دیرۆکا زانستیّ فەلسەفیّ بنیاتێن ڕێبازێن فەلسەفیّ و ئەگەرێن خەلەت یێن بیردۆزین هزرڤانێن چوویی دەرئێخت بۆ هندیّ دا دپاشەرۆژێدا دووبارە نەهێتە کرن و ڕوینەدن. هیڤی و باوەری ب هێزا ژیریّ مرۆڤایەتی وشیانا ویّ دەدەرونیّ مرۆڤیدا پەیدادکەت بۆ نیاسینا جیهانیّ ویاسایێن ویّ دگەل گرنگییا زانیاری، ڤەکۆلینا دیرۆکا فەلسەفیّ گرنگییەکا رامیاری - کریاری - پەروەردەیی پەیدادکەت، هەروەسا بیرهاتنا مرۆڤی بوان زانیارییێن فەلسەفییانە دەولەمەتر دکەت کۆ مرۆڤ ل ماویّ کاروانیّ خۆییّ درێژ بەهرەمەند کربوون، هاریکارییێ ژی دکەت بۆ وەرگرتن و پەرەپێدانا باشتر ین تیتالێن ویّ هزریّ. گرۆڤە و نموونە و رابەرییّ ددەتە مرۆڤیّ بۆ ب دەستڤەئینانا تایبەتییا خۆیا سەرەکی کۆ هزرو ڤیانا زانینەکیّ ل دیرۆکا نڤێسینا فەلسەفەکاری دیرۆکا فەلسەفیّ نڤێسی یە. گوهنەدان ب ڕابردویا هزرکرنیّ

د زانستیدا دهێته کرن، بەلێ د فەلسەفێدا ئەڤە ناهێته کرن. چونکی دیرۆکا فەلسەفێ فەلسەفەیە ب شێوەکێ دیارکری و پێشڤە چوونەکا پێکڤە گرێدای دەردکەڤیت. ئەو گیرو گرفتێن فەلسەفییانە کو فەیلەسوفێن بەرێ ل سەر ئاخفتینە، نهوژی ماینە ودپاشەروژی ژیدا دێ میننە ڤە و بابەتێن وێ نەگوهۆرینە هەر چەندە توخمێ نوی ئێخستیە سەر. هندی دیروکا زانستییە، ئەو پشکێن ب سەر ڤەچویی کۆ زانایان پێکول کرینە بگەهنە راستیا زانستی. یان خەباتا وان هاتیە ژبیرکرن پشتی گەهشتنا خودانێن وان بۆ مەرەمێن خۆ.

## قوناغێن وێ یان دابەشکرنێن سەرەکی یێن دیروکا فەلسەفێ:

نڤیسینا فەلسەفێ ل ڕۆژ ئاڤای ژ لایێ پڕانیا نڤیسەرێن بەراهیێ هەتا ڤان نێزیکان ب فەلسەفا یۆنانی دەست پێکریە بگرە ب چەند لاپەرەکێن کێم ژی ب لایێ فەلسەفا ئیسلامی ڤە نەچوون و درژدن ژی ل سەر هندێ کۆ ل رۆژهەلاتا کەڤن (چین و دولا دوور وباران ومیسرا کەڤن) فەلسەفە نەبوویە.

ئەم دەربارەێ دیرۆکا فەلسەفێ پەیرەوێ ئەڤێ دابەشکرنا خوارێ دێ کەین:

١- فەلسەفا ڕۆژ هەلاتی ل هیندو دولا دوو رویباران ومیسرا کەڤن.

٢- فەلسەفا یونانی وفەلسەفا رۆمانی .

٣- فەلسەفا ئیسلامی.

٤- فەلسەفا نوی، ل سەردەمێ ڤەژاندنا ئەورۆپی وپشتی وی سەردەمی.

**ئێك:** پەیدابوونا حەزو ئارەزوویێن هزری وفەلسەفی ل سارستانیا دولا دوو ڕوباران ومیسرێ گەلەك ژ کەڤن شارستانیەکا ڕەسن بخۆڤە دیتبوو و مرۆڤێن دناڤ ڤێ شارستانییێ دا هەردەم ڕژدبوون ل سەر ژیانەکا نوی و پێشکەفتی، ل

ڤێرەدا: بتنێ دێ ل سەر دوو نموونان ژ ناڤەندێن شارستانیا کەڤن ئاخڤین کو (دولا دوو روباران ومیسرا کەڤنە).

## ١- ڕێبازێن هزری و فەلسەفی ل دۆلا دوو ڕوباران:

هزرکرن ل دۆلا دوو رووباران، ڤەدگەریتە ڤە بۆ شارستانیا سەردەمێ بەرینی، شارستانیا سۆمەرییان ب کەڤنترین شارستانیا وێ دەڤەرێ دهێتە هژمارتن. ئەڤ شارستانیە ژی (شارستانیا سۆمەریان) بەرهەمێ ئاف و ئاخێیە، ئەڤان هەردو توخمان (ئاف و ئاخ) پێدڤیێن چاندنێ وتەڤن دروستکرنێ و ئامانێن ئاخێ وخشتێ نەخش و نیگارو نڤێسینێ بۆ ئاکنجیبوویێن دناڤبەرا دیجلە و فراتی دابین کربوو، چونکی سۆمەرییان وەسا هزر دکر کۆ مرۆڤ ژ ئاف و تەڤنێ هاتییە دروستکرن، وپاشی ئەو کۆمەل و هوزێن کو ل گزیرتا عەرەبی هاتین، وەك ئەکەدی و ئەموری و هۆزێن دی. پاشی چوون و مشەختبوون ل جهەکی بۆ جهەکێ دی، ل دۆلا دوو روبارو ولاتێ سۆمەرو ولاتێ شام و میسرێ خۆ جهبوون. حەمورابی (١٧٩٨ب - ز - ١٧٥٠ب - ز) پاشایێ شەشێ یێ بنەمالا بابلی یا ئێکێ بوو، وژهەمی پاشایێن دی زێدەتر گرنگی ب یاسا و دانانا یاسا و دادپەروەریێ دایە ئەو شونوارێن کەڤن کو دناڤ جەرگێ ئەردیدا هاتینە ڤەدیتن، هەمی ئەو هزرێن فەلسەفیانە دئێخنە بەرچاڤ، کۆل دۆرێن گەردوونی وژیانێ دزڤرن، ئانکو ل سەر گەردوونی و ژیانێ دئاخڤن وەك ل (چیرۆکا ئافراندنێ) (الخليفة) و (داستانا گلگامێش) و د چەندین دەقێن دیدا ل زمانێن کەڤنە ڕەسەن دەردکەڤیت:

**ئەم دشێن ڤانبیرو بوچوونان بکەینە سێ پشك:**

### أ- هزرا فەلسەفەیا گەردوونی و سروشتی:

دەرکەفتنا هزرا فەلسەفی ددۆلا دوو ڕوبـارانـدا ب پێنگاڤێن ئێکێ یێن زانستێن

سروشتی ب گەردوناسی و بیرکاری ژ لایەکی و ب ئەفسانێ ژ لایەکێ دیڤە یا گرێدایبوو. فەلسەفە ب ڕامانا رێك و تایبەتمەندییا وێ وەك شێوەکێ جودا ژ شێوەێن هوشیاریا کۆمەلایەتیا مرۆڤایەتی هێشتا دەرنەکەفتبوو. پێشڤەچوونا چاندنێ و ئاڤدانێ و ئاڤەدانکرنێ پێدڤی ب بەرفرهەکرنا زانیارییێن زانستی بوون بۆ بکارئینانا وان د ژیانا کارێ ویدا، پێدڤی یێن ژیانێ ب تایبەتی یێن ئابووری پێدڤی ب دانانا ڕۆژ ژمێرەکا ڕێك و پێك بوو بۆ چاڤدیریکرنا هەیڤ و ڕۆژ و ستێران، پشکداری د پەرەپێدانا زانستێن وان دکر. بابلیان بنیاتێن جەبر و ئەندازیاریێ دانان و رێبازەکا نێزیك ڕەگێ دوو جاری ڤەدیت وچەوانیا شیکارکرنا هەڤکێشان پلا دووێ ئێخستە بەرچاڤ. هەروەسا بابلیان پەیرەوی (شێستی) دژمێریارییێدا داهینا کۆ هەتا ئەڤروکە دهەمی لایێن جیهانێدا دهێتە بکارئینان (۱ دەمژمێر ٦٠ خۆلەکە و ۱ خولەك ژی ٦٠ چرکەیە).

هەولدان و دەرکەفتنا هیڤی و نیازێن فەلسەفیان ب ئێکەم هەولدانا هزرمەندێن گەڤنێن عیراقێ دهێتە هژمارتن ب تایبەتی ئەوێن پەیوەندی ب تێگەهشتنا دیاردێن گەردوونی و دەربرین ژ خەم و لێنرینان هەی.

ئەڤ هزرکرن سەرەتایی رۆلەکێ گرنگ هەبوو ل پەیدابوون و سەرهلدانا بیر و بوچونێن فەلسەفێ دناڤ ئاکنجیێن دۆلا دوو رووباراندا. وئەفسانە هێدی هێدی هاتنە گوهۆرین بو بیرو باوەرێن هزری و فەلسەفی سەبارەت ب نەژاد و بنە جها جیهانی دەرکەفتنا بۆ نەوەران ئێك ل دویف ئێك. ژبەر هندێ دێبینین: ئەو ئەدەبیاتێن ل دۆلا دوو رووباران یا پڕە ژ چیرۆکێن ئافراندنێ (خەلیقە) و چیرۆکێن توژینەوە سەبارەت ب مرن و نەمرنێ ولێگەریان ل دویف ژیانێ وتشتان. د ڤێرەدا بتنێ وێنەکێ سەرتا سەری دێ بۆ ئینین دەربارەێ (ئافراندنێ) خەلیقەت.

باوەریێن کەڤنێن عیراقی ئاڤێ ب ژێدەرێ هەمی بونەوەرێن دی دادنیت. بەلێ پشکنین و توژینەوە دەربارەی ژیان و نەمریێ، داستانا ب ناڤودەنگا گلگامێشی بۆ نموونە دێ ئینئن. ئەڤ داستانە بۆ مە دەردئێخەت، کۆ چەوا گلگامێش ب مرنا (ئەنکیدۆ) یێ هەڤالێ خۆ پەریشان بوویە و حێبەتی بوویە ول دویف هندێ دگەریا کو چەوا ساغ بکەتەڤە ملحەمەکێ دا بهێنیت، یان ڤەبینیت دا مرۆڤی ژمرنێ رزگار بکەت.

هێماییێن ڤێ داستانێ ئاماژە بۆ هزرا فەلسەفێ یا کویر و بلند دکەت هەرچەندە ب لۆژیك و فەلسەفێ نەهینایە گۆرێ. مەزنترین تشت کۆ شارستانییێن مەیێن کەڤن پێشکێشی مرۆڤایەتیی کرین، ڤەدیتنا (بیرو بۆچونان) بۆ (هێما) پاراستنا وێ ل سەر ڤورا (تەڤن) سور هاتیە کرن بەری هزاران سالان بوویە.

**دەربارەی ئەڤان هزرو بیرا، هەول بدە بەرسڤا ڤان پرسیاران بدە:**

**بنیاتێ هەبوونێ چییە و ئەگەرێ پەیدابوونا وێ چییە، چەوا بونەوەر ڤەدیتینە؟**

ژێدەرێن کەڤنێن عیراقی ل سەر ڕاستیا گەردوونی وەسا رێککەفتبوون و دبێژن: هەمی بونەوەر (موجودات) ب مرۆڤی ژیڤە ژدایکبوونێ هاتینە گۆرێ، چ تشت ژبلی دوو هۆکاران دەرناکەڤن ئەو ژی (دایك و باب) ب رامانا نێر و مێ. پەیدابوونا بنەرەتی یا ڤی کاری ژی (ئاڤە) ئاڤا پیرۆز کۆ ژ دوو توخمێن نێر و مێ کار لئێکودو دکەن ئانکو پەیدادبن ب رێیا هێزەکا نەدیار کو دئاڤێدا یا هەی دشێت ڤێ ئاڤێ بکەتە ژیان بۆ بۆنەوەران هێزا خۆ ب خەملینیت وگەشەبکەت دبەردا. لەورا دبینین هەمی بوونەوەر پێدڤی ب ئاڤێ هەنە ونەشێن بێ ئاف ژیانێ ب بۆرینن. نە مرۆڤ و نە گیاندار نە ڕووەك بێ ئاف ناژین. هندی بوونەوەر هەنە بێ

ئاڤ ناڤێن ئەڤە ژی د قورئانا پیرۆزدا ب روونی هاتیە و خودایێ مەزن دبێژیت هەمی تشت مە ژئاڤێ دروستکرینە مە گیانێ دایێ (سورەتا الانبیاء) هەروەسا د دەڤێن کەڤندا (مرۆڤ ژ تەڤنێ دروست کریە، ئەو تەڤنا کول نیڤا دەریایا کویراتیا وان دەرئێخستیە، چونکی ئەو جۆرێ تەڤنێ گەلەك یێ پاقژە)، لەورا دهێتە گوتن: مرۆڤ ب پاقژی هاتیە دروستکرن و سروشتێ وی یێ پاقژە و ل هەرپیساتیەکی یێ دویرە - د ڤی بواریدا بیرو بۆچونێن جۆرا و جۆر هەنە.

لێنرینا لێکدانەڤەیا گەردوونی د عیراقا کەڤندا - ل پشتی نەمان و هەلوەشاندنا داستانان دبێژت ئەڤ گەردوونە بازنەیەکا رێکو پێکە زیندەیی (حیویە) وچالاکی پێڤە دیارە دڤێت هەمی تشت ژ پێخەمەت ئارمانجەکێ دهێت و دچیت، ئانکو ل دۆرێن ئارمانجەکێ دزڤریت ئەو ئارمانج ژی گوهدانا خودا وەندیە بۆ گەهشتن بۆ بەختەوەریا مرۆڤی، ئەوا کو ل سەر ئەردی رویددەت (نیڤا خارێ یا تەپا ئەردی، هەبوونا تمامە) ودزڤریتەڤە بۆ ئەگەرێن هەبوونێ دئەسمانیدا (نیڤا سەری یا تەپێ) دبازنەبوونێدا ل سەر ڤی بنچینەیی سالۆخەتێ تمام داینە ب هەبوونێ چونکی باوەریا وان وەسا بوو کۆ بازنە تمامترین شێوێن ئەندازییە وسەرجەمێ پلێن وێ دگەهیتە (٣٦٠) ب هەر چوار گۆشێن دیێن راوەستای، هەڤنیشان وەکی ئێکن دگەل ئێکدا ل خالەکا مەلبەندی وژ ئێکو دوو ماوەکی وەکو ئێك ددویرن (تیرە ونیڤەتیر) یێن ئەندازیی (الهندسیة).

## ب- هزرو بیرێن رەوشتی و جڤاکی:

بەلێ مەسەلا باشی و خرابیێ ودادپەروەری و تشتێن ڕەواو و نەروا و بەختیاری و بارگرانیێ، کۆ شوونوارێن عیراقێ یێن کەڤن ل سەر بەحس کریە، وەك (سەبری ئەیوب) و (میلا حەمووراپی) و (چاکسازیێن ئۆرکاجینا) و (پەندی ئەحیقار) و

(گزیرتا بەختیاری و نەمری دلمون) ئەڤە هەمی بابەتی (فەسەفا روشتینە) دزارافی هەڤچەرخدا. چونکی هزرمەندێن عیراقی یێن کەڤن، باوەری ب سروشتێ باش هەبوو و د هەمان دەمدا باوەری ژی بەخرابیێ هەبوو د مرۆڤیدا، د هەمان دەمدا دیسان باوەری ب وێ هەبوویە کول پشتی دیاردێن زۆرداریێ وبارگرانیێ تشتێن دی ژی هەنە، د ڤێرەدا مە نەڤێت زێدەتر ب بەرفرهەیێ بەحس بکەین چونکی ئەو ئاخفتن یا دویرو درێژە و بەرفرهە - هەر چەوابیت ئەڤ بیرو بوچوونە دهێتە دابەشکرن ب سەر دو جۆرێن بۆ چوونان:

**ئێك:** ل دەڤ مرۆڤی حەزا باشیێ و حەزا خرابیێ ژی هەیە، چونکی ل دەسپێکێ وەسا پێکهاتیە.

**دوو:** دبێژن مرۆڤێ باش د سروشتیدا هەیە چونکی ژ تەڤنەکا جوان هاتیە دروستکرن، بەلێ خراپکاری د ژینگەها ویا جڤاکیدا دەرگەهـ پێدائێخستییە وکارتێکرن لێ کریە ب باشی وب خرابی هەروەسا ژینگەهێ و جڤاکی ژی کارەکێ تەمام هەیە و هەبوویە ل سەر مرۆڤی.

هزرمەندێن عیراقی یێن کەڤن ب هزرو وهش و دویربینێن خۆ وئەزموونێن خۆ دژیانێدا داکوکی ل سەر هندێ کریە کۆ مرۆڤ گیاندارەکە وچارە نڤێسێ وی هەر ڕۆژەکێ ژ ڕۆژان مرنە، ئەڤجا بۆ هندێ ژمرنێ نەترسیت وژبیرا خۆ ببەت، هەتا دەمێ مرنێ دگەهیتێ دەست ب کارکرنێ ودروستکرنا خانیان بۆ خۆ و دەستکەفتێن مەزن بەرهەم ئینایە بۆ خزمەتکرنا مرۆڤی، بۆ هندێ دا بیرو باوەرو کارێن جوان ل پشت خۆ ب جهـ بهێلیت. کارەکێ وەسا بکەت خەلك ژبیر نەکەت ودیرۆك ژی هەردەم شییان وهێزو وزەیا ژیری وشییانا جەستەیی ژ بیرناکەت، کو بۆ خزمەتکرنا هەڤرەگەزێن وی ئەنجام دایە و بەرەڤ پێشڤەچوون و بلندبوونێ پال پێڤەنایە هەتا بەرەڤ پلا شارستانیا پیشکەفتی بری، ئەڤ سەرکەفتن و

شارستانیە ژی بتنێ بۆ خۆ دویرئێخستن ژ زولم و زوداریێ و ئەگەرێن وێ وئەنجامێن وێ نەبیت ب کت یان ب کۆم. پێکڤە ناهێت ومرۆڤ ل بن سیبەرا وێ نا حەوییێت.

ئەڤجا ژ پێخەمەت بەربەستکرنا پالدەرێن خراپکار ل هندەك دل و دەرونێن نەزان. دەستەلاتا تەپەسەر بۆ ب خۆ و ب هەمی شێوەێن وێڤە (کۆمەلآیەتی ، ئایینی، رامیاری) هاتیە گوریێ بۆ پاراستنا لاوازان ل بن دەست و زولما ب هێزان (پارەدارو وخانەدانان و دەرەبەگان یێن دەسەلاتا خۆ سەپاندی). هەروەسا یاسا هاتنە دانان. ژبۆ پاراستن و چاڤدێریا (ئازادیا خەلکی وئاسایش و مافێ ژیانێ ب سەربەستی ودیر ژ توندوتیژیێ). هەروەسا ئاسایش ژی دانا بۆ دانانا سنوریێ هەڤبەندیێ دناڤبەرا تاکەکەسێن جڤاکی ودام و دەزگەهێن وان. ئەڤەیە ئارمانجێن هەڤپشك یێن هزرمەندێن شارستانیا عیراقا کەڤن. هەروەسا کەڤنترین چاکسازیێن مرۆڤایەتی، کو گەهشتینە مە (چاکسازیێن ئورکاجینا) نە (٤٢ سەدە بەری زایینی). کو ل سەر (ئازادیێ = وەکهەڤیێ) دئاخڤیت، ژپێخەمت هندێ هەژار ب خۆشی بژین دگەل دەولەمەندان دپێکڤە هاریکاریا ئێکو دو بکەن دکاروبارێن دونیاییێدا، ل چارچوڤەکێ موکمێ ئێکرتی بژین وبرێڤە بچن ونەهێلن دوژمن وبیانی: ئەوێ ئێکگرتنێ پارچە پارچە بکەن ل دەمێ هێرشان دهێنە سەر.

بەلێ د **(داستانا گلگامش)** دا ئەو شانازی بۆ هزرمەندێن شارستانیا عیراقا کەڤنە، کو هندی بابەتێن فەلسەفا مرۆڤایەتی هەنە وەرگرتینە و لێڤەکۆلینە ب شێوازەکی دروستکریە کۆ دگەل شارستانییێ بگونجیت وبۆ مە ب جھ هێلایە. هەروەسا ل سەر بهایێن ڕەوشتی ژی ئاخفتینە، لەورا دێ بینین دەسپێکا ئەڤێ داستانا نەمر ب هەلویستەکێ ڕوون دەست پێدکەت ول سەر ئاڤەدانکرنێ ودانا دئاخڤیت وب مرۆڤێن هەمی سەدە و چەرخان بەری ٤٤ سەدەیا دبێژیت:

- ئەوی هەمی تشت دیتینە -ئەرێ ولاتێمن، ب ستر انان بیرهاتنا وی بکە.

- ئەوی هەمی تشت زانینە -ومفا ژ دانا و ئەزمونان وەرگرتیە

- ئەو دانا و هوشمەندە ب هەمی تشتان . . . هتد. بۆ هندێ ب داوی بهینیت، ب نەخۆشیێن مرۆڤی و ژناڤچوون وشەرخوازیێ وبەرهنگاربوونا کارێن گران، هەتا ڕاگەهاندنا ئەڤ ئەنجامێن ل خوارێ:

**ئێك:** سەرکەفتن ب سەر ترس و دوو دل یێ ولاوازیێ وتەك پەرستییا نەرەسن.

**دوو:** لێنرینا ژیانێ ب چاڤەکێ گەشبیانە، دگەل هندێ ژیدا مرن ب بەرچاڤێت مە دهێت ودچیت بەلێ دبێژیتە مرۆڤی زیرەکبە و ترسا خۆ ژمرنێ ب بەزینە . . . ب کارێ باش و ب هاریکاریێ و ئاخفتنا ب مفا وکارێن باش و کریارێن باش و پەسەند و دژی شەر و نەتەمامیێ ڕاوەستا وزولم و زورداریێ ڕەت بکە نەهێلە ل دل و دەرونێ تە جهێ خۆ بکەت.. تو ب ڤان کریاران هەردەم: ب زیرەکی وچاڤ نەترسی دیژی، هەروەك دداستانێدا هاتیە ل سەر زارێ (گلگامێش)ە زەلامێ زیرەك قارەمانە و ناڤێ وی ل ناڤ ناڤێن نەمران دێ هێتە تۆمارکرن، ب ڤێ داستانا وی داویێ ب گیرو گرفتێ (چارەنڤێسی) دهینیت ب شێوەکێ ئەرێنی. کو بۆ مرۆڤی ڕاگەهاندیە دشییێت ب نەمری بمینیت، ئەگەر خزمەتەکا باش پێشکێش کەسانێن دی بکەت. بیرهاتنەکا باش دێ ل سەر زارێ خەلکی بیت ل پشتی مرنا مرۆڤی و ژناڤچوونا لەشێ وی، ناڤێ وی ب نەمری د دیرۆکێدا دێ هێلین وبەرەباب ئێك ل دویڤ ئێك ب باشی ناڤێ وی دێ هینن.

بەلێ هزرا (دادپەروەریێ) و خەباتا مرۆڤی ژ پێخەمەت وێدا ئەو بوو کو دەستورێن عیراقا کەڤن ڕێکخستییە، وەك دەستورێ ئورنەمو (٢٢ سەدە ب. ز)

ئەڤە تۆمارکریە، هەروەسا (عەشتار) ژی (ل سەدەیێ ٤٠ێ ب.ز) ل دویف دەستورێ خۆ تۆمارکریە. هەتا دئێنە سەر میلێ حەمورابی (١٧٥٠ ب.ز) ئەڤ دەستورە ب تەمامی ئینایە گۆرێ وبەلاڤکریە و کار و فەرمانێن حاکمێ دادپەروەر و قازیێ ب وژدان و مرۆڤێ هوشیار دەرئێخستیە. جڤاکێ بەختیار ئارمانجا خوداوەندان و مرۆڤی بوویە.

**ج- دەستکەفتێن زانستی وئەزموونێن عیراقی یێن کەڤن ژ بەندێ د بەندێن چوویدا ناڤێ وان مە ئینایە.**

## ٢- حەزو ئارەزویا فەلسەفێ وزانستان د دۆلانیلدا :

پەیدابوونا شارستانییەتێ دمیسرا کەڤندا، ڤەدگەریتە ڤە بۆ هزارا چارێ ب . ز دەربارەێ تەماشەکرنا گەردوونی وزانیاریێن بیردۆزانە، دێ بینین پەیوەندی دناڤبەرا (خودێ و مرۆڤی) دا ڕێکخستیە و هزرا ئێك خودایی ل دەڤ وان پەیدابوویە، وباوەری ئینان ب ژیانا پشتی مرنێ هەبوویە، کو تێدا خەلات وسزا نەك بتنێ ب پەیرەوکرنا شێوەکارێن ئایینیڤە د گرێدایینە بەلکو ب ڕەفتارو ڕەوشتێ پاقژێ ژیانێ ژی ڤە دگرێداینە وب نەمری وجودا ژ لەشی دانا بوون، دروستکرنا ئەهرامان وخۆش کرنا تەرمێ مریان ئەنجامێ ئەڤێ هزرێیە.

ب ڤی شێوەی میسرییێن کەڤن بنیاتێن باوەریێ ب دووانیا (ثنائیة) (گەردوونی ومرۆڤی) کریە وراگەهاند خوداوەندیان ئێك خودێ بەرامبەر ب کەرەست و گەردوونێ مادی هەیە. لەش ژی بەرامبەر دەروونێ مرۆڤی ب شێوەکێ لێکدانەڤە ئەفسانێن خۆ ب نەژادێ گەردوونێ دانایە.

ئاڤ (نون) ب نەژادێ بونەوەران (موجودان) دانایە. ل وێ ژی خوداوەند

پەیدابوون کو هێزێن سروشتی وەکی گەرمێ وشهێ د دەرببڕن. هەروەسا ئێك ژ وان ئەفسانان خوداوەند (فناح) دبێژیت، کول رێیا پەیڤا (ببە)، تشت دروست دبن، ئەڤ هزرە، هزرا پەیڤا (کریستیان) بیرا مە دئینیت، یان ئەو فەرمانا خودێ مە دئینیتە بیرامە، کو ئەگەر تشتەك ڤیا د قورئانا پیرۆزدا دبێژیت (ببە). ئەوژی دەست ب هەبوونێ دکەت. (إنما قلنا لشيئ إذا أردناه ان نقول له كن فيكون) (النحل-٤٠).

ئاکنجیێن میسرا کەڤن ڕۆلەکێ شارستانی (هزری و زانستی) یێ دیار و جودا هەبوویە ئەو ژێدەرژی سەبارەت هزرێن میسریێن کەڤن کو هەتا ئەڤرۆ گەهشتیە مە، وەکی (بەردیات) و (پەرتووکا مرییان) و دەڤێن هیرۆغلیفی ودەڤێ (منفس) سەبارەت ئلفراندنێ. زانیاریێن زۆر سەبارەت گەردوونی وهزرا ڕەوشتی بخوڤە گرتیە (تێدایە).

ئەو هەمی ژی ل دۆرێ ئێك تەوەر (محور) دزڤریت ئەوژی (گەردوون)، (ڕۆژ و هەیڤ). ب هویر بینی دێ بینین وەکهەڤیەك (تشابە) یا هەی ل ناڤبەرا هندەك بۆچوون و لێکدانە ڤەیێن بیردۆزەی سەبارە گەردوونی ژلایێ میسرییان و بۆ چوون ولێکدانەڤیێن عیراقییان سەبارە ب ڕەسەنیا تشتان، د دەڤێ (باژێرێ منفس)دا دێ بینین: هزر دبۆ چوونا هزرمەندێن میسری دوان دەڤان دا هەول ددەن، فەلسەفێ ولێکدانەڤەکا هوشیارانە بۆ نەژادی بوون و ئافراندنێ بینیت و ب (ئاف) وخوداوەندێ (فناح) وب وێ پەیڤێ بگرێ دەنەڤە، کول سەر ئاڤا بیردۆزدا هاتیە گۆتن. هەر تشتەکێ هەی، یا نبۆ نەوەرەك ب هەلکەفتنا هۆکارەکی هاتیە گۆڕێ. ئەو ژی ژدایك بوونە (زاوزێ)یە. ئەڤجا ل هەر بوونەوەرەکی دوو هۆکار هەنە ئەو ژی هەبوونا (نێر) و (مێ) یە ئەگەر ئێك ودو گرت ل دویڤ ئەفسانێن کەڤن و

هزر و بۆچوونێن هزرمەندانایێن کەڤن، هەبوون (وجود) دهێتە گۆڕێ و ناڤەڕۆکەکا ڕەوشتی و پەروەردی تێدا دهێتە کرن و جەماوەرێ خۆ پێڤە گرێددەت و ڕێز لێ دهێتە کرن و دهێتە پاراستن.

هزرمەندێن کەڤنێن میسری لایێ ڕەوشتی ل دەڤێن (ژیانا دووێ)دا ئەوان چارسەرکر کو دپەرتووکا (مرییان)دا (کتاب الاموات) دهێتە دیتن گەفێ ل خەلکێ دکەت ودبێژیت: نەوەبیت کارێ خراپ بکەن چونکی چ کەس ل دونیایێ، یان دژیانا دوێ دا ژ دەستێ سزادانێ رزگار نابیت ئەگەر هاتوو دڤێ دونیایێ دا کارەکێ خراب بکەت ل وێ دونیایێ حساب وسزا چاڤەرێێ وی دبیت -هزرکرنا مرنێ (ژناڤچوون) چارەسەری د هزرا کەڤنا میسری دا بۆ ڤەدیتیە ئانکو بۆ وێ دانایە مرۆڤێن باش ونەمران وخودان کریارێن باش و کارێن بهانەمریێ بۆ خۆ دابین دکەن بۆ نموونە (بیرهاتنا باشیان) هزرەکا کەڤنێن میسرێ چارەسەریا (مرنێ) ب جەستەیا ماددێ کریە بۆ مریێ ب رێکا دو داهێنانێن زانستی ومەرەما ژ هەردو داهێنانێن زانستی یا ئێکێ مومیاکرنا لەشی (التنحیط) دزانستێ نوژداری دا. ئەوا دیتر ئاڤاکرنا (ئەهرامات) ژ زانستێ ئەندازیاری وفەلەکی یە ب تایبەتی ئەو ئەهراماتێن بۆ (فیرعەونان) تەرخان کرین. چونکی ئەو فیرعەون دهزرا میسری دا بلندبوون وگەهشتبوونە پلا خوداوەندێن پیرۆز هەتا شاە (ئەخنا توون = ئەمنوفسێ چوارێ) هەڤژینێ (نیڤەرتیتی) هزرا ئێکگرتنا پەرستنێ (التوحید) ئینا گۆڕێ وهزرا پەرستنا ئەختەران داهێنا دڤی بیاڤی دا بزاڤا (ئەخنا تون)ی ل گەل مەرەمێن پێغەمبەر ئیبراهیم خەلیل-ی (س) دئێکبوونێ داکو ژ ئێك خودایێ مەزن زێدەتر دئەردێ بابل دا نینە، بەلێ هەردو گازیێن میسرێ و عیراقێ ژلایێ ڤەکۆلینێ ڤە جوداهیەك هەیە دناڤبەرا وان دا.

## ٣- فەلسەفا یۆنانی:

ل دوماهیا سەدێ حەفتێ و دەستپێکا سەدێ شەشێ ب - ز ئەڤ فەلسەفا یۆنانی بۆ جارا ئێکێ ل سەر کنارێ ڕۆژئاڤایا ئاسیا. بچووکدا ل (ئەیۆنیا) سەرهلدا و پاشێ ل ئیتالیا و باژێرێن کناریێن گزیرتا سەقلیان و پاشی ژی ل ئەسینا ل سەدێ پێنجێ (ب - ز) پەیدابوو ل سەدێ پێنجێ و چوارێ گەهشتە ئەو ڕادێ پێشکەفتنێ بەلێ هۆکارێن دەرکەفتن و پەیدابوونا فەلسەفا یۆنانی ب مەرەما هژمارتناوان نە ڕاڤەکرنا وان و هندەك هۆکاران دێ ئینین نە هەمیان:

١- پێشکەفتنا بەراهیێ یا شارستانیەتا دۆلا دوو ڕوبباران (میزۆ پۆتامیا) و میسرا کەڤن و شارستانیەتا فینیقی یان و شارستانیەتێن دەریایا ئیجە ب دەستڤەئینا بوون.

٢- جهێ جوگرافی یێ بازرگانی کو تایبەتە ب گزیرتا مەلا تایە و ئاسیا ناڤەنددا، ب جهەکێ بازرگانی دهاتە دانان دگەل ڕۆژئاڤادا، چونکی ژ مەلبەندێن شارستانیەتێن



فەلسەفا یۆنانیا کەڤن

کەڤن نێزیکە (بەراهیێ مە بەحسێ وان کر) ئەڤ گزیرتە ژی، ئێکە ژ دووازدە گزیرتێن کو هەرێما (ئەیۆنیا) پێك دئینین د ئاسیا بچویك دا.

٣- بارێ سیایی وهزری یێ باش بوو، چونکی ب ئاشتیانە و هەڤپەیمانداری دگەل هەفسۆیێن خۆدا ژیایە.

٤- ئازادیا هزرکرنێ ب تایبەتی دئەسینادا هەبوویە، چونکی چ فەلسەفەکا ناڤەندی نەبوویە بهێتە سەپاندن ب سەر هزرمەندان ورێکێ ل ئازادیا هزرو بیران بهێتە گرتن یان بشێوەکێ گرێدای بهێتە ئاراستە کرن بەلکو هزرێن وان بتنێ هەر تشتەکێ ئایینی و کریاری بوویە.

ل سەر مرۆڤی هەر ئەو بوو کو پێشبینیێن خۆ وهزرو بوچوونێن خۆ سەبارەت گەردۆنی و مرۆڤی دابرێژیت کا چاوا ئەو هزردکەت. ئەگەر ڤەگەرینە بۆ سەدێ شەشێ (ب-ز) دێبینین چالاکیێن هزرو بیرێن کورێن ئەو ولاتێن کوکە کەفتبوونە بن دەستهەلاتا یونانیان وهەمی ل دۆر (نەژادێ گەردوونی بوون) دزڤرین. پرسیارا فەلسەفی یان سەبارەت ناڤەرۆکا وێ (الجوهر) ئەوێ ڤەشارتی ل پشت هەبوونێ دکر. د ڤی کارێ وان ب هەر رەنگ و شێوەبیت پابەندبوون ب بەرسڤێن فەلسەفیێن میسر و عیراقێ ڤە دگەل هندێ دا، کو ئەوان مفا ژ دەستکەفیێن زانستیێن جودا جودا وەردگرت، وەکی نوشداری و بیرکاری و فەلەك و فیزیا و دەریا ڤانی یێ ژی (الملاحە) دەورەکێ گرنگ هەبوو بۆ ئێك گرێدانا راستەوخۆیا ئاکنجیێن گزیرتێن یۆنانی وکنارێن باکوورێ دەریایا سپی ب ئاکنجیێن کنارێن شامێ و باکوورێ ئەفریقیا، ژ لایێ شارستانیەتا سەربازی ڤە زێدەباری ئەڤان هەمیان ژی دێ بینین زانست خوازان ولایەنگرێن زانیاریێن بیانی بەرەف ناڤەندێن شارستانی چوون ل دۆلا دوو رویباران و دۆلا نیل، بۆ وەرگرتنا زانست و زانیاریێ و ڤەگەریانەڤە بۆ ولاتێن خۆ یێن پاشکەفتی بۆ بەلاڤکرنا شارستانیەتێ.

دشێن پەرسف و شرۆڤەکرنێن فەلسەفا یۆنانی ل دویڤ گەشەکرنا قوناغێن دیرۆکێ بۆ سێ قوناغان دابەش بکەین:

## پێنگاڤا ئێکێ: فەلسەفا یۆنانی هەتا سوکراتی:

### أ- فەیلەسوف ل جیهانا دەرڤە ڤەدکۆلن:

پرسیارا مەزن دڤیردەدا ڕەسەنێ تشتان چییە؟ ئایا گوهۆرین و زۆری هەیە؟ ل سەر وی بناغەی دشیاندایە خواندنگەهێن زۆر هەتا هاتنا سۆفستایان دیاربکەین خواندنگەهـ ژی ئەڤەنە: خاندنگەها ئایۆنییان، خواندنگەها ئیلی، خۆاندنگەها زوری، خواندنگەها فیثاگورسی، خواندنگەها گەردیلەی. هەر چەندە خواندنگەها ئایۆنییان کو ب ناڤێ ئایۆنیایائاسیا بچووك ناڤکریە فەیلەسۆفێن وێ بەرسڤا ئەو پرسیارێن سەری یا دای کۆ بۆ جارا ئێکێ بەرچاڤ کرینە وپێکۆل کریە ب شێوەکێ فەلسەفی زانستی بەرسڤ بدەن، کو ڕەسەنێ تشتان ئێك توخمە. یان ئێك تشتە کو ئێکەم کەرستێ هەمی تشتەکی یە. ئەڤ توخمە یان ئەوە، یان تێکەلەکێ وەکهەڤە دهەمی تشتان دا؟، یان بایە، ئانکو ئاگرە. دگەل هندێ کو ڕەسەنێ تشتان ب ئێك ژوان توخمان دانایە، دان پێدان ب هەمە جۆریا و زۆری و گوهۆرینێن تشتان دایە. دڤێرەدا (خواندنگەها ئیلی)* ئەڤ بۆچوونە ڕەت کر: چاوا تشت هەمەجۆر و زورن و گوهۆرین بێ دکەڤیت، ئەگەر ڕەسەن وپێکهاتنا وان ئێك توخم بیت؟ ئەو شرۆڤەکرن پێدڤی یە ئێك ژڤان دوان بیت: یان باوەرنەکرن ب هەمی گوهۆرین وهەمەجۆران وزۆریێ بێژین ئێك ڕەسەن وئێك هەبوون هەیە، کو ئەڤە بۆچوونا فەیلەسۆفێن (ئیلیا) یا باشوورێ ئیتالیا بوویە ول سەر بناغێ وێ گوتنێ (خواندنگەها ئیلی) پێکهاتییە کو دان پێدان ب چ زۆری و گوهۆڕینەکێ نەدا و دگوت کو ئەڤە کریارا زانیاریا هەستی درەو و ڕوخسارا خاپینەرە. بەلێ زانیاریا

---

* ئیلی: بۆ باژێرێ (ئیلیە) یێ باشوورێ ئیتالیا.

تەمام کو ژیری دگەهیتێ ئەوە کو هەبوون ئێکە چ کورسیك بیت یان دار. هەبوون خۆیەتیا جەوهەرێ تشتانە، جوداهیێن وان جوداهیێن لاوەکینە ئەڤ هەردوو خواندنگەهێن سەری، دبێژنێ خواندنگەهێن ئێکاتی.

بەلێ شرۆڤەکرنا دووێ یا ڕەتکرنا بەراهیێ: سەلماندنا زۆریێ و گوهۆڕین و ڕەسەنێ تشتان ئێك نینە، بەلکو چەند ڕەسەن وتوخمەکە. دڤێرەدا توخمێن ب ڕەسەنێ تشتان دانایە (ئاڤ و هەوا و ئاگر و ئاخ): فەیلەسۆفەکێ دی گوتیە (توڤ) یان (گەردێن) ئێکجار هویر ڕەسەنێ تشتانە ژ موی وخوین و گۆشت و هتد تێدا یا هەی، ل وان هەردوو بارودوخوان ژی تشت ژ چوار توخمان پێکهاتینە یا ژ گەردیان، ل پشکا جودایا وان ڕەسەنان پێکهاتینە (ژوان توخمانە یان ژوان گەردیلانە). تایبەتیێن هەر ئێك ژوان توخمان یان گەردیلان ب بنەجە دمینەڤە، توشی گوهۆڕین و ئازاراندنێ نابن، بەلکو ئەوا دبیت ئەو توخم یان گەردیلە تێکەل دبن، ئەو لەشێ پێك دئینین (تێکەلە) نینە، بەلکو تێکەلە کو ب ڕێکا (خرڤەبوون و جودابوونێ)ڤە ئانکو تشتەکێ نوی دروست نابیت، بەلکو بتنێ هاتنا دگەل ئێکە و خرڤەبوونە، وەکی دندکێن گەنمی و جەهی و نیسکان پێکڤە کوم بکەین. (خواندنگەها فیثاگورسی) ژی خواندنگەها گەردیلەیی بوویە دگەل هندێ ژی کو (هژمارە) ب ڕەسەنێ یان دەسپێکا هەمی ئافراندیان دانایە. هژمار ژلایێ وان ڤە شێوێ ئەندازیاری وەردگریت، بۆ نموونە هژمارا سێ (٣) ب سێگوشێ وەکهەڤە، ژبەر هندێ ب ڕایا وان چ لەشەك نینە ژ هژمارەکێ پێك نەهاتبیت، ئانکو ب شێوێ هژمارێ نەبیت، ئانکو شێوێ ئەندازیاری هەیە. ژبلی ڤێ ئەوان دان پێدان ب وان چوار توخمان دایە کو ڕەسەنێ تشتانە، ئانکو وان باوەری ب پێکهاتنا کەرەستەیا

تشتان. بەلێ وان وەسادانا کو تشت شێوە وجهی وەردگرن، شێوەکێ ئەندازیاری وەکی تەپێ یان خشتەکی وب وی شێوی. هەر وەکی (فیثاگۆرسیان) گۆتی ل باشوورێ ئیتالیا پشتی مرنا فیثاگورسی پێکهاتبوو. فیثاگورس کو ڕێکخراوەکا ڕامیاری ئایینی فەلسەفی بوویە، دژایەتیا دیموگراسیا ئەسینی کریە. فیثاگورس دبێژیت دەروون کەرستە نینە و ب ڕەنگێ وەرگرتنێ ل ناڤ تشتان دهێتە ڤەگوهاستن.

## ب- ئەو فەیلەسۆفێن ڕووی کریە ڤەکۆلینا مرۆڤی:

سوفستایی ل سەدەیێ پێنجێ بەری زاینی پەیدابوون. ئەوان وەل فەلسەفێ کر کو بچیتە گرنگییێ ب مرۆڤی بدەت ل شوینا گەردوونی. ئانکو ژ ڤەکۆلینا گەردوونێ بو ڤەکۆلینا مرۆڤی ئەڤە ب ئەگەرێ هندێ بوویە کو ئەسینا ب سەر ئەیۆنیا وهندەك گزیرتێن دەریا ئیجەدازال بوو وب سەر فارسان سەرکەفت و (پێرکلێس) دەستورەکێ دیمکراسی بۆ ئەسینا دانا و پێدڤی ب بووچوونێن سیاسی و یاسایێ وهەلبژارتنان زێدەکر.

د ڤێرەدا پێدڤی ب ووتار بێژان بۆ ئاخفتنێ وکارتێکرنێ ل جڤاکی پەیدابوو. ب ڤی شێوەی ووتار بێژ (الخطیب) پەیدابوون وئەڤە پەیدابوون وئەڤە ڕامانا سوفستایێ بوو د دەستپێکێ دا (ووتاربێژ بۆ کرێ) بوویە ئەوان گەلەك داکوکی ل سەر دووپاتکرنا ڕێژەیا هەر زانیاریەکێ وهەر راستی یەکێ دکر. دگوت ڕاستی وشاشی وباشی و خرابی گشتی نین، بەلکۆ باشی و خرابی ئەوە کو تاکەکەسی دبینیت. ئەڤە ڕامانا وتارا (پڕۆتۆگراس)یە دامەزرێنێ خواندگەها: (مرۆڤ پیڤانێ هەمی تشتەکی یە).

**سوکرات:** سوکرات کو ل سالا (٣٣٩ ب -ز) دەرکەفت دگەل ئاراستێن سۆفستایان نەیار بوو، هەر چەندە وەکی وان ژ فەلسەفا سروشتی و ڤەکۆلینا گەردوونی دووير کەفتبوو و فەلسەفا ل چوار چوڤێ ڤەگۆلینا مرۆڤی هێلا بوو ودگوت (ئەی مرۆڤ

خۆ بنیاسه). ل سەر باشییێ دئاخفت و دگەل زانیارییێ هەڤ جووت دکر. ژ لاییێ وی ڤە ئەوێ زانینێ دزانیت دێ ییێ باش بیت. ئەڤە ڕامانا ئاخفتنا وی یە (باشی زانینە) پویتە ب (دیارکرنا) ڕامانا پەیڤ وتێگەهان دایە ئانکو ڕامانا دانانا ناساندنا بنەجە بۆ تشتان. ب ڤی شێوەی شیا بەرسڤا سوفستیان بدەت کو وان یاری ب پەیڤان دکر. ب تاوانا تێکدانا لاوان و ب خرابی بەحسێ خوداوەندان بریارا کوشتنا سوکراتی هاتیە دان. ب بریارا دادگەهێ دزیندانی دا ژەهر خوار. باوەریا وی ئەو بوو کو دەروون پشتی مرنێ دمینیت. گەلەك خواندنگەهـ ل سەر فەلسەفا وی پەیدابوون وئێك ژ هەرە ڤوتابیێن وی یێن مەزن ئیفلاتۆن بوو. سەکراتی چ پەرتووك ل پاش خۆ نەهێلا بوون بەلێ هویربینی د (هۆنەرێ پەیکەرتاشیێ)دا، ددەمێ ڤەکۆلینا وی یا فەلسەفی دا سەبارەت مرۆڤی و سروشتێ مرۆڤی بنەما و بناغێن زانیاری وپەیکەرێن خۆدا زانیاری بجە هێلایە و شوینوارێن وی دیارن. سوکراتی دژیانا خۆدا، بەرهنگاری ئەوێ ئالۆزییێ بوو، کو سوفستایان ب سەر ژیرو هزرا لاوان سەپاندبوو، ئانکو ژیرییێ وان پێ خاپاندبوو.

ئەڤ فەیلەسۆفە لدویف زانا بوونێ کەفتبوو، هەردەم ب بەردەوامی دگەل خۆ دئاخڤت، ئەڤ زانا بوونە (حکیم) ئەڤەیە (ئەی مرۆڤ خۆ بنیاسە) هەتا بشێن ئەڤێ دەربڕینێ کو ڕۆژەکێ ژ ڕۆژان ژ ڕەبەنەکێ گوهـ لیبۆوی ئەی سوکرات تۆ ل ناڤبەرا هەمی ئەسینیان زاناتر وب دادتری. (سوکراتی) گەلەك ب جەرگانە بەرهنگاری هزرو باوەرێن سوفستیان دبوو، باوەری ب پێغەمبەراتییێ هەبوو، باوەری ب هزرا ڕەوشتی و ئایینی هەبوو، باوەری ب ژیانا جارا دووێ هەبوو و دادپەروەری و ڕاستی هەبوو، هەر چەندە سوفستایان بەرهنگاری و ڕێك لێ گرتن دبێخەمەت ڕاستی وڕاستێ کاریا وی دا، بەلێ سوکراتی سەرێ خو نەشوورکر و هەر

بێ ڕژد بوو ل سەر هزرو باوەرێن خۆ. لەورا نەیارێن وی ل ناڤ دەستهەلاتا حکومەتا یۆنانی وبریارا گرتنا سوکراتی دا تاوانەکا مەزن پێڤەنا و دادگەهێ حوکمێ مرنێ ب سەردانا وب ژەهرێ هاتە گۆشتن. ئەوی بخۆ ژی نە دڤیا ژ زیندانێ برەڤیت.

قوتابیێ وی ئەفلاتۆن گەلەك ب شانازی وب جوانكاری ڤە هزرو وبووچونیێن وی د پەرتووكا (نەمریا گیانی) تۆكاركر، هندی هزو وبووچوونێن سوكراتی كو هەبوون، سەبارەت ژیانا دووێ و دادپەروەریا خو دای تێدا بەرچاڤ كر.

سوكراتی ل سالا ٣٣٩ ب -ز ژەهر خوار ومری پشتی ئەوێ هەر چێ ژ دیتنێن وی یێن فەلسەفی و زانستی وڕەوشتی هەی هەمی دامەزراندن وقوتابیێ وی ئەفلاتۆنی، كو پشتی وی ئەرستو گەشە پێدا و نەهێلان هز و بۆچوونێن وی ژناڤ بچن.

## پێنگاڤا دووێ

## پێنگاڤا ڤەژاندنا فەلسەفا یۆنانی ( هەبوون و ڕەوشت )

### ئەفلاتۆن و ئەرستۆ:

ب سێدارەدانا سۆكراتی، فەلسەفە تووشی نەهامەتیەكا مەزن بوو، بەلێ هزو بۆچوونێن سوكراتی و بەرنامێ وی ژلایێ قوتابیێن ویێن ژێردەست ب گەریانی ل دویڤ زانست و فەلسەفێ. كر، و گەلەك ب چاڤەكێ بلند سەحكرنە سوكراتی و مفا ژێ وەرگرت، هەتا ڤەكۆلینێن وان ل سەر دەستێ ئەفلاتۆنی و ئەرستوی بگەهیننە پایەكی بێ كێماسی.



### ئەفلاتۆن ( ٧٤٣ ب - ز):

ئەفلاتۆن فەیلەسۆفەكێ ئەسینی (اثینا) پەرتووكا (كۆمار) و (یاسایان) و (دان وستاندن) دانایە، پشتی كو

مەندەهۆش بوویە ب فەلسەفا سوکراتی. دانوستاندن دژی سوفستیان تۆمارکر. ب سێدارەدانا سوکراتی گەلەك دلگران و پێ نەخۆش بوو.

خەباتکر ب بجهئینانا چاکسازیێن کومەلایەتی -ڕەوشتگەری - فەلسەفی بەلێ سەرنە کەفت چونکی شرۆڤەکرنێن وی د ڤی بیاڤی دا دوورهێل (واقعي) نەبوون.

أ- ئەفلاتون د فەلسەفا خۆدا پشت ب دوو بەرنامان (سەرکەفتن) و (پاشکەفتن)ێ گرێدا بوو ل پێکئینانا زانیاریێ سەبارەت گەردوون و ڕەوشت گەریێ - دێ بینین: د بەرنامێ سەرکەفتنێ دا (چوون بەرەف ژووری) پشت ب تێبینی و خواندنێ دگرێددەت، بۆ هندێ ژ گەردیێن بەرچاڤ وهەستپێکری بچیت بۆ ڕامانا گشتی و سەرتا سەری، وەکی کەس بتنێ بچیتە (مرۆڤایەتی). بەلێ د بەرنامێ (هاتنا خوارێ) ئەفلاتۆنی ب گرۆڤەکاری بکارئینا بۆ هندێ هەتا ل زانیاریێ ل ڕامانا گشتی یا سەری، ئانکو ژ (مرۆڤایەتی) بچیت بۆ گەردیلێن هەست پێکری (تاکە کەسان) وەکی کاروان وپیرۆ ت و سوارێ وی د ڤی بابەتی دا.

ب- ئەڤی فەیلەسۆفی، فەلسەفا گەردوونی ل سەر دوو بنامایان دامەزراند هزرا نموونەی (مثالي) و بوونەوەر. ل دەف ئەڤی فەیلەسۆفی، سێ خوداوەندێن مەزن هەنە و دبێژنێ یان ناڤ ل سەردانا ئەو ژی (ئەندازیارێ مەزن) و (بهای نەگوهۆڕ) و (هەبوونا بێ سنوور) د جیهانا ئاسمانی دا (کو نموونا تەمام و بلند بۆ هەر تشتەکێ هاتییە ئافراندن). د داویدا (سروشتێ شێلی) کو پێدڤی ب یاسا و ئەندازیاریێ هەیە. (ئەندازیارێ مەزن) سروشتێ شێلی ڕێك دئێخیت و یاسایێ بهای و جوانیێ ڕێك دئیخیت. ناڤەڕۆکێن ئەردی ل وێنە بهایان یێ ڤالابوو. هەر وەکی کاروبارێ دەروونی د لەشی دا. گیانێ (وێنەکێ نموونەیی)

ئاسمانیه ئێخستیه لەشێ سروشتێ ئەردی لەوڕا دەروون خەباتێ دکەت بۆ جودابوونێ ژ لەشی و ڤەگەڕیتە ڤە بۆ ئەسمانی ب ڕێکا مرنێ. یان گیان گوزەکی (تناسخ الارواح).

ج- ئەفلاتۆنی خواندگەهەك بۆ فەلسەفێ دامەزراند ناڤێ وێ کره (ئەکادیمی یە) ل سەر دەرگەهێ وێ نڤیسی (بتنێ ئەو کەس دهێنە ژوورڤە یێن کو ئەندازیاریێ دزانن) چونکی پویتە ب ئەندازیاریێ وبیرکاریێ ل ڤەکولینا فەلسەفی و ڕێکخستنا هزرو بۆ چوونان و بەرچاڤکرنا تشتان ددا. خەبات دکر جڤاکەکێ بینیتە گوڕێ کو فەیلەسۆف ببنە ڕێڤەبەر، چ خرابی و ئازار تێدا نەهیتە کرن. وەکی ئەوا د جڤاکێ ئەسینا دا دهێتە دیتن. ژبەر ئەڤی فەیلەسۆفی هەمی زانستێن هەبوونێن گشتی، جەهەر و چ هەیین نموونێن هزری هەنە و زانیاریێن ڕاستن و شیا د ڤی بیاڤی ل دویڤ ماموستاییێن خۆ بکەڤیت، چونکی مامۆستاییێن فەلسەفێ پشت ب هەستکرن و گومان و دیاردێن گوهۆڕینا گرێددەن بیرکاری ژی ب نموونەکێ دهێتە دانان بۆ بۆچوونێن هزرا بلند کو چ گومانێ ب خۆ ڤەناگریت.

ج- ئەفلاتۆنی باوەری ب نەمریا گیانی و ڤەگەڕیانا وێ بو جیهانا ئەسمانی هەبوو هەروەسا باوەری ب (گیان گوزەکی - تناسخ الارواح) هەبوو، کو د ئێك ڕەسەنێ هەڤپشکدا دمینیت، ل هەمی ئافراندیێن زێندی.

مرۆڤ د بۆچوونا ئەفلاتۆنی دا، ئەو ئافراندیە (مەخلوقە)، کو مەزنیا ئەندازیارێ مەزن تێدا دیار دبیت، گیانی دگەل لەشی دا کوم دبیت و دناڤ مرۆڤیدا سێ گیان هەنە (شەهوانی) و (توڕەیی) و (ژیری)، ژیرییێن خەلکی ئەڤێن کو گیانێ

وان، ئانكو مێشك یێ بالاَ دەستە سەر گیانێ تورەییدا (ل دل گیانی) ب ڤێ باشی و پەسەندیێ بۆ خۆ ڕادكێشیت، هەست ب ڕاستییێن پر ژ خێرو بەرەكەتا مەزن دكەت. ئەڤە ئەو دل خۆشی یە، كو كەس هەست پێ ناكەت ژبلی ئەوێن (فەلسەفا میتا فیزیكی) دزانن. (كو خۆ ل دۆرێن جیهانا ئەو لایێ سروشتی ددەن) زانینا ڕاست و ڕەوا ئەو زانیارییە، كو بابەتێن خوداوەندان وجیهانا نموونەی و ئەسمان و باشی . . . ئەڤەژی ئەو ئارمانجە، كو دل دەرونێ مرۆڤی دویڤدا دگەریت د سەمتا پاقژكاریێ دا، هەتا ڤەگەڕاندنا وێ یا بلند و پەسەند بۆ جیهانا هەوای (الاثیر)، بدەستڤە دئینیت هەروەسا جیهانا نموونەی.



## ٢- ئەرستۆ (٢٢٣ ب - ز):

ئەرستۆ . . . فەیلەسۆفەكێ مەكدۆنیەفەلسەفە ل (ئەكادیمیا ئەفلاتۆنی خواندییە هەردەم ل سەر هەڤالێن خۆ یێ سەركەفتی بوویە. هزركرن ل خواندنا فەلسەفێ و ڕەخنەگرتن ل (ئەفلاتۆن)ێ مامۆستای وی ل (نموونەیی) بكارئینایە، باوەر ب (زێندەیا ئەختەڕان) كو ل بەراهیێ مە بەحس كریە هەبوویە. عیراقییێن كەڤن ب رێز ڤە ناڤێ وی دئینێن و دبێژن ئەڤی، ڤەكۆلینا فەلسەفێ گەهاندە گۆپیتكێ. ئەڤە و خویندكارێن وی دگۆتنێ (ڕێ پێ چودان -المشائین ) چونكی فەلسەفە د ڤوتابخانا خۆیا نوی دا دگۆت د باخەكی دا پشتی مرنا مامۆستایێ وی كرە ناڤەندنێ گوتنا فەلسەفێ. چونكی ب ڕێڤەدچوو دەمێ وانە دگوت، ئەرستۆ ماموستایێ ئەسكەندەرێ مەگدونی ژی بوو ل كوچكا شاهانەدا بۆ ماوێ چەند سالّەكان.

ئەرستۆ ژبەر زیرەكیا وی ب (مامۆستایێ ئێكێ) هاتە ناڤكرن و چەندین داهێنان

دەربارەی فەلسەفا جۆرا وجۆر دانانە، بتایبەتی دبیاڤێن لۆژیك و بەرنامە و بەحسێن زانستی دا . . ژبەر هندێ ئیسلامیان ددویڤدا ناڤێ فارابی ب مامۆستایێ دووێ دانا.

## ١- بەرنامێ ئەرستۆی:

ئەرستۆ ب بەرنامێ خۆیێ زانستی ناڤ و دەنگێ خۆ ئینابوو، ئەڤ بەرنامە ژی پشت ب تێبینیێ گرێددا. گیرو گرفت دەستنیشاندکرن و ئەڤجا رووی دکرە کێم وکاسی و ئالۆزیان و بارو دۆخێ هەر ئێك ژ وان دهەلسەنگاند. بیروبۆچوونێن زانایێن بەری خۆ ژی وەردگرتن و باشیێن وان دهەلبژاردن، هەتا دگەهشتە شرۆڤەکرنا گۆنجاو بۆ گیرو گرفتان.

ئەرستۆی بەرنامێ بیرکاری - لۆژیکێ د بەحسێن جودا جودایێن خۆدا، بکاردئینان، داکو کارتێدا بکەت هەتا (زانستەکێ گرۆڤەدار ئانکو گرۆڤەیی) دابمەزرینیت، کو پشت ب زانیاریان وبیرو باوەرێن دەسپێکی بگرێدەت بۆ یاسایێن ئەگەری (السببية) د زانستێ سروشتیدا.

فەلسەفا وی: فەلسەفا ئەرستۆی فەلسەفەکا خۆرستی (خۆزایی) بوویە کو بابەتێن وێ (هەستپێکەر و لڤینەر) ێن گیانداران بووینە ولسەر بنیاتەکێ موکم پشت ب زانیاری و ئەگەرو ئەنجامان هاتیە دامەزراندن، هەتا دگەهیتە ئەگەرێ ئێکێ د وێ لڤینێ دا، ئەوژی پشتی کو بۆ دەرکەفتی کو تشت دجیهانا خورستیدا (خۆزایی) لسەر چوار ئەگەران هاتییە دامەزراندن (ئەو کورسیکا کو ئەم لسەر د روونین دێ بۆ نموونە وەرگرین):

**ئێك:** ئەگەرێ کریاری کو ئەگەرێ دروستکرنا کورسیکێ یە (ئەگەرێ نێزیك) (ئەو دارتراشە).

**دوو:** ئەگەرێ کەرستەیی (ماددی)، کو ئەگەرێ ماددێ ئەوێ کورسیکێ دیار دکەت (ئەودارە).

**سێ:** ئەگەرێ شێوەیی شێوە وشێوازێ ئەندازەییێ وێ کورسیکێ یەکا ب چ شێوەکێ ئەندازەیی و هونەری هاتییە دروستکرن.

**چار:** ئەگەرێ مەرەمی، ئانکو مەرەم ژ دروستکرنا وێ کورسیکێ کو (ڕوونشتن)ە.

ئەڤ هەمی ئەگەرو ئەنجامە لگۆر چەند یاسایەکێن هەمەجۆر لسەر (ئاستێ هەبوونا خورستی) گوهۆری کار ل ئێکودوو دناڤ لڤینەکا بەردەوام ژ (پەیدابوون و ژناڤچوون) وگوهۆڕینی دکەن.

فەلسەفا (میتا فیزیکی) (چ لپشتی سروشتی هەیە) بابەتێ وێ لدەڤ ئەرستۆی هەبوونە ب رەهایی (الوجود بالأطلاق) لەورا بنیاتێ زانیاریان (ئەگەرێ ئێکێ) (خودایێ مەزن) دامەزرێنەرە ب وی سالوخەتێ  کو ئەگەرێ لڤینەرێ هەمی تشتانە بێی کو ئەو بلڤیت. ئەرستۆ بابەتێ چاوانیا چ هەی پشتی سروشتی (میتا فیزیقیا) ب گرنکترین بابەتێن فەلسەفێ دهژمێریت ب هندێ کو ئەو بخۆ دهەمی زانیارییێن خۆدا ژیری و بیرو باوەرێن سەرەکی و پێرابوونێن بلندێن تشتێن پایە دارێن جیهانا ئەسمانی دیاردکەت. ژوێ ژی کو هۆشێن ئەختەرێن کارلێکەر . . . کاریگەریا وان لسەر جیهانا ئەردی یە. بەلێ فەلسەفا ئەرستۆی دەربارەی رەوشتێ بابەتێن، مرۆڤی و خێر و خۆشی و کریارێن باش لگۆر نێرینەکا پەروەردەیی ڤەدگریت.

تێدا ب خۆ مرۆڤ وەکی بەر پەڕەکێ سپی لدەسپێکا هەبوونا وی دیاردکەت پاشی ئەو ب خۆ وزانیارییێن خۆ دچارچوڤەکیدا پێدگەهیت، لەورا ژی پویتەکێ گرنگ ب پەروەردەکرنێ دایە ب وێ چەندێ کو ڕە و ڕیشالێن خۆڕەوشتیا باش و زانیارییێن راست و رەوان دا هێلاینە -بەختەوەریژی لدەڤ ئەرستۆی هەستکرنە ب کارێ فێرکرنا هەر کەسەکی هەتا دگەهیتە راددێ هەستکرنێ ب بهایێن جوانییێ و باشییێ کو ئەڤەژی ب ڕاستی جهێ دلخۆشیا مرۆڤیە. باشی لدەڤ ئەرستۆی (ناڤەندەکا

زێرینه) (الوسط الذهبي) ب هندێ مرۆڤ خۆ ژ لادان و توندتره و یێ (التطرف و الانحراف) دەربارەی ب روخسارێڤه خۆ دویر دادنیت.

زەلامێ باش ژی ئەو کەسە کو (زێدە) و (زێدەروی) (الافراط و التفریط) د هەلویستیێن رەوشتیدا ب ئەگەرێ سوسە کرنا ب (ناڤەندا زێرین) هەڤسەنگ ناکەت، ئەڤە ژی ژ زالبوونا (هێزێن هۆشمەندیێ) یە (القوی العاقلة) بسەر هێزێن دناڤ مرۆڤیدا وەکی (تۆرە بوون و حەزکرن) (الغضب والشهوة)ێ دهێتە گۆرێ.

بۆ نموونە مێرخاس ناڤەندەکا مام ناڤنجی یە دناڤبەرا (ترسنۆکیی) و (دینە مێرییێ) دا (الجبن و التهور)، بەلێ دادوەری ب وەکهەڤیێ دناڤبەرا رەفتارا مرۆڤی و یاسایا ڕەوشتی یێ ل قەلەم ددەت. د ڤێرەدا ئەرستۆ دەرباری فەلسەفا خۆیا ڕەوشتی و ڕامیاری وکومەلایەتی بەحسێ خێزانێ و پەروەردێ و جڤاکی و ڕێکخراوان و ڕێساییێن گشتی دکەت.

لدوایێ دەمارگیری بۆ ئەسینا هەبوو و ب (ئەسینی) هاتە ناڤکرن ئەوا بسەرێ سوکراتی هاتی بسەرێ ئەرستۆی ژی هات، دەمێ تووشی پیلانێن وەکی پیلانێن بەراهێێ بووی و بهندێ کو (ئەرستوییێ بیانیە و خەلکێ ئەسینا نینە) ئەرستۆ ژی هەر بشەڤ ئەسینا بجه هێلا ودگۆت (من نەڤێت جارەکادی خەلکێ ئەسینا فەلسەفی تەپەسەر بکەن).

ل سالا ٣٣٢ ب.ز ئەرستۆی وەغەرکر پشتی کو سوپایێ قوتابیێ وی (ئەسکەندەرێ مەکدۆمی) هێرش بەرەف جیهانا رۆژهەلاتێ بری هەتا گەهشتە چینێ، ئەڤە لداویێ ل باکورێ بابل مرییە و ل دەڤەرا ئەسکەندەرییە ل سالا ٣١٨ ب.ز هاتییە ڤەشارتن.

بابل ژی ژبەر کووراتیا دیرۆکا وێ و شارستانیەتا وێ یا قەشەنگ و کارێ ناڤەدانکرنا وێ کربوو پایتەختێ شاهنشینا خۆ یا ڕۆژهەلات.

## قوناغا سێیێ: فەلسەفا یۆنانی پشتی ئەرستۆی (گۆمانکار - ئەپیکوس - لیوانکی - قوتابخانا ئەسکەندەریە):

### ١- گۆمانکار (الشكاك):

ئەڤ ڕێبازە ل سەدێ چوارێ و سیێ زایینێ بەلاڤبوویە هەتا سەدێ ئێکێ و دووێ زایینی بەردەوام بوو.

وان تێدا دگۆت بریار و هەڤدژێ وێ وەکهەڤن لدویف ڤێ نابیت بریار لسەر تشتان ب تەمامی بهێتە دان، بۆ نموونە بریارێ لسەر تشتی نادەن و دبێژن دزانم بەهشت هنگڤین و شرینە و ئاگر سووتنە، بەلێ جۆرێ بێ بریاریا وان خۆشی و بەختەوەری و ئارامی دەسکەفتە، ئەڤە ژی لدەڤ وان هەردووان مەرەما وان فەیلەسۆفن و راستیا وانژی بنەجهیاخۆ نینە لدەڤ وان (گۆمانکار).

### ٢- ئەبیکۆرسی (الابيقورية):

ئەڤ ڕێباوەرە (ڕێبازا گەردیلەی)یا یۆنانیە ولسەر دەستێ (ئەپیکۆرسی)ی گەشەکریە، قوتابخانانەیەك ل ئەسینا بناڤێ (باخچێ ئەپیکۆرس)ی هاتییە دمەزراندن، ب بەرۆڤاژییا بۆ چوونێن (دیمۆکرتیسی) ئەڤی وەسا هزردکر گەردیلان گرانی یاخۆ هەیە و سروشتێ وان ئێك نینە ب ڤێ ژی وان جوداهی دناڤبەرا گیاندارادا لێکدایە ڤە و باوەری ب هەبوونا سروشتی هەبوویە، بەلێ پێکۆلا هندێ ژی کریە کو سەربەستییا مرۆڤی بشێوەکێ گەردیلەیی لێکبدەت ب وێ رامانێ کو گەردیلە دڤالاهێیدا لدویماهییێ دکەڤنە خوارێ دشێن ژ سەمتا خۆ لادەن و خۆاربن ب ڤێ نێرینا سادە ئەوێ دسەلمینیت کو لادانا گەردیلان مەرجەکێ گرنگە و ئێکگرتنا گەردیلان تشتەکێ دەمییە و داخازا تاما هەردەمی ئانکو ژیراتی یا وی دکر. د بیاڤێ ڕەوشتی ژی دا داکۆکی ل هندێ دکر ئەو مرۆڤێ کو باوەری ب رۆژا دوماهییێ نینە.

## ٣- ليوانكى[١]:

ئەڤ فەلسەفە ل سەدێ چارێ بەری زایینێ پەیدابوویە هەتا پشتی زایینێ ژی بەردەوام بوویە. ڕەوشت تەوەرێ فەلسەفا وانە کو لسەر زانستێ سروشتی و لۆژیکێ و فەلسەفێ هاتییە دامەزراندن. فەلسەفە لدەڤ وان باخچەکە کو زانستێ سروشتی ئاخا زاخا وی یە و لوژیك پەرجانێ وییە و ڕەوشت بەرهەمێ وییە خودای دگەل جیهانا کەرەستەیی دانایە هەمی جیهان لدەڤ وان گیاندارەکێ زێندیە و گیانەکێ گشتی هەیە و یان یا ب یاسایەکا گشتی ڤە گرێدایە بۆچوونا وان وەسا بوو کو جیهان ئێك تەپە و یا پڕە، لگۆر نەخشەیەکی یان (القدر) - قەدەرەکا گەردوونییا خودایی و تێکڕایی یە ب مەرەم و ئارمانج هاتییە وەرپێچان، کریارێن کەسان ملکەچی پێدڤیێ نە و ژێ ڕزگار نابن. ئەوا هەی ئەرێ ژخۆ ئەم لگەل دچین یان لسەر مە هاتیە سەپاندن (لیوانکی) هەتا راددەکی خۆ گۆریکرن بەرژەوەندیا گشتی بەری بەرژەوەندیا تایبەتی یا خۆ دانا بوو وان باوەری ب (هەڤوەلاتییێ جیهانێ) هەبوویە ئانکو یۆنانی و نە یۆنانی و ژن و مێر و بەندە و ئازاد هەمی وەکهەڤن.

## ٤- خواندنگەها ئەسکەندەریە:

پشتی دامەزراندنا ئیمپراتۆریەتا ڕۆمانی، رۆژ ئاڤایا وێ توشی پێلەکێ ژ ئاراستە و شێوەکاریا ئایینی یا ڕۆژهەلاتێ ببوو، ب تایبەتی یا ئایینێ مەسیحی. فەلسەفێ شێوێ ئایینی وەرگرتبوو.

د ڤێرەدا (خواندنگەها ئەسکەندەری) لسەر دەستێ ئەفلاتۆنێ مسری پەیدا بوو و هزرا (دەرهاتن) و (ڕژیانێ) ئێخستە بەرچاڤ، (ئەفلاتۆنێ مسری) (٢٠٣ - ٣٧٠) ز

---

(١) ئەو فەلسەفە ب ناڤێ وێ (لیوانکێ) ناڤکریە، چونکی خودانێن وێ ل لیوانکێ دگەهشتنە ئێك.

ل مسرێ ژ دایك بوویه و دگەل هەوەكێ دژی فارسان سەرا ڕۆژهەلاتێ دایە پاشی چووینە ڕۆما ئێك ژ ڤوتابیێن وی نڤیسینێن وی د بەرگەكیدا كۆمكرینە بناڤێ (نەهان) كو پێنجی و چار نامێن بچووكن، بسەر شەش كۆمان هاتینە دابەشكرن كو هەر ئێك ژ وان نەه نامەیە و بابەتێن وان: مرۆڤ و ڕەوشت و جیهانا هەستپێكری و چاڤدانا خودایی و دەروون و ژیری و یەكێتی، ئەفلاتۆنی وەسا دیتیە كو: خودایێ تەمامە هەمی هەبوون بشێوێ زنجیرە پەیدابووی لدەستپێكێ كەرەستە ئەڤەنە: ژیرێ ئێكێ، پاشی دەروونێ گشتی، دەروونێ كەسی، لەشێ گیانداران، هەتا دگەهشتنە كەرەستێ ئێكێ كو ئەڤە ڕێكا هاتنا خوارێ یە بەلێ ڕێكا چوونا سەری، ڕێكا ڕزگاربوونێ ژ جیهانا ماددی كو ژ جیهانا هەستپێكریان دەستپێدكەت و بلندبیت بەرەف خودای پشتی مەشق و ڕاهێنان و ڕەنجا گیانی.

## فەلسەفە د شارستانیەتا چینێ دا :



فەلسەفە د چینا کەڤن دا بەری هزارەها سالان دەرکەفتییە و کەفتبوو بن کاریگەریا سێ ئاراستێن سەرەکیێن هزرکرنێ (بوذی تاوی - کۆنفۆشیوسی). هەمی ئەو بیروباوەرێن ئایینی ب شێوەکێ کو تێکەلی دناڤبەرا واندا هەبوو کو گەلەک ل ئێکودوو نێزیکبوون.

ئایینێ بەربەلاڤ ل چینێ پێکهاتییە ژ تێکەلبوونا بابەتێن ئەفسانەیی دگەل هەرسێ هزرێن فەلسەفی (بوذی -تاوی -کۆنفۆشیوسی). فەلسەفا (کلاسیکی) چینی دچەرخێن کەڤندا دەستپێدکەت و هەتا داویا حوکمڕانیا بنەمالا (تشین)، ئەڤ ماوە ب گرنگترین قۆناغا داهێنان و ڕەسەناتییا هزرو بیران دهێتە دانان ل چینێ.

### کۆنفۆشیۆس :

ل سالا (٥٥١ ب.ز) ژ دایك بوویە و ل سالا (٤٧٩ ب.ز) مالئاڤایی کرییە (مریە). ئانکو لسەر دەمێ بنەمالا دووێ یا حوکمرانێن چینێ ژیایە و ژ خێزانەکا خانەدان بوویە و هەر ژ زارۆکیا خۆ حەزا بجهئینان و پشکدارکرنا هەلکەفتنێن ئایینی هەبوو ودکر دپەرستگەهاندا ول قوناغا گەنجینێیدا گەلەك حەز ژ زانست و زانینێ و ڕەوشەنبیریێ دکر و هەر زووی شەهرەزاییەکا زۆر د بیاڤێ سیاسەت و زانستی دا پەیدا کریە لەورا دناڤ خەلکیدا ناڤودەنگی یا وی دەرکەفت.

چینیان بەری کۆنفۆشیۆسی گەلەك پویتە ب نڤیسین و تۆمارکرنا ڕوویدانان و بابەتان نەددا (بتنێ چەند هەلکەفت و ئاهەنگەکێن ئایینی یێن دیارکری نەبن).

بەلێ کۆنفۆشیۆسی ئەڤ سنوورە بەزاند و دەست ب نڤیسینێ و تۆمارکرنا ڕوویدانێن تایبەت ب دەستهەلاتێ وبڕێڤەبرنا وێ و بیروباوەرێن کۆمەڵایەتی و ڕەوشت و تیتالان، بەلێ کۆنفۆشیۆسی پویتە ب ڤەکۆلینا بابەتێن چ هەی پشتی سروشتی (میتا فیزیقیا) و گەردوونی و ماددەی و پێکهاتیێن ماددی ودیاردێن سروشتی نەدایە بەلکو پتر جەخت لسەر پویتە دان ب ڤەکۆلینا مرۆڤی دایە.

نهێنییا سەرکەفتن و بەڵاڤبوونا هزروبیرێن کۆنفۆشیۆسی ب ڤی ڕەنگێ بەرفرەه ل چینێ و دەردۆرێن وێ ڤەدگەریت بۆ گرنگیدانا کۆنفۆشیۆسی ب ڤەکۆلینا (جڤاك)ی و ئەو بابەت و بەحسێن هەڤبەندی ب ژیانا هەڤوەلاتیێ ئاساییڤە هەی ژ (ڕەوشت و ڕەفتار و سەردەریا کۆمەڵایەتی و ڕامیاری و خۆشتڤیاتی یا خەلکی و سەرەدەریا باش دگەل واندا و دەست پاقژی و زمان پاکی و ڕێزگرتن ل رووی سپی (دان عەمر) د (جڤاك)یدا و ب پیرۆز ڕاگرتنا خێزانێ و گوهداریا ژنێ بۆ هەڤژینێ وێ و د هەمان دەمدا دژاتیا ستەم و زۆرداریێ دکەت و دبێژیت: ((حکومەت ژبۆ خزمەتکرنا خەلکی یە نەك بەروڤاژی).

لگۆری هزروبۆچونێن کۆنفۆشیۆسی رەوشت و ئاکار و سەرەدەریا دەستهەلاتداران لگەل هەڤوەلاتیان خۆ د ئەڤاندا دبینیتن:

أ- ڕێزگرتن ل وان کەسێن کو ژ هەژی ڕێزلێنانێ نە.

ب- نێزیك بوون و پابەندبوون ب هەڤبەندیا باش لگەل ئەو کەسێن هەڤبەندیا مرۆڤاینیێ و کومەلایەتی لگەل کاربدەستان گرێددەن.

ج- سەرەدەریا باش لگەل بەرپرس و کارمەندان ژلایێ دەستهەلاتداران ڤە.

د - پویتەدان ب بەرژەوەندیا گشتی.

کۆنفۆشیۆسی پێنج پەرتووک دانابینە کو پۆختەیا بیرو باوەڕێن وی تێدا هاتینە و مفا ژ بەرتووك و ژێدەرێن کەڤن یێن بەری خۆ وەرگرتینە:

١- پەرتووکا هۆزان و ستران.

٢- پەرتووکا دیرۆکێ.

٣- پەرتووکا گوهۆڕینان.

٤- پەرتووکا بهار و پاییزێ.

٥- پەرتووکا هەلکەفتێن ئولی (ئایینی).

## بنیات و بنەماییێن هزرکرنا کۆنفۆشیۆسی:

١- گوهداریا بابێ د خێزانێدا.

٢- گوهداریا برایێ بچووك بۆ برایێ مەزن.

٣- گوهداریا دەستهەلاتدارێ دادپەروەر.

٤- دلسۆزیا هەڤالان بۆ ئێکودوو.

٥- بریندارنەکرنا کەسێن دی لدەمێ دانوستاندنێ.

٦- گۆتن و کریار وەکیئێك بن.

## پرسیارێن پشکا چارێ

پ ١/ گرنگیا دیرۆکا فەلسەفێ چیە؟

پ ٢/ دەربارەی بیردۆزێن ژدایکبوویێن گەردوونی یێن بابلی چ دزانی؟

پ ٣/ لێنێرینا مسریان و عیراقیان دەرحەقێ کێشا (نەمری) و چارەنڤیسی چییە؟

پ ٤/ کاروانێن مەزنییێن دیرۆکی یێن فەلسەفێ بهژمێرە.

پ ٥/ هزرا عیراقێ و هزرا (دۆلا نیل)ێ کەڤن روون بکە.

پ ٦/ ئەگەرێن پەیدابوونا فەلسەفا یۆنانی چنە؟

پ ٧/ بکورتی خواندنگەهێن فەلسەفیێن یۆنانی یێن بەری سوکراتی دیاربکە.

پ ٨/ بۆچی ئەفلاتۆن ب فەیلەسۆفەکێ نمونەیی دهێتە ناڤکرن؟

پ ٩/ ڕاستیا هەڤرکیێ دناڤبەرا سۆفستائیان و سوکراتی چییە؟

پ ١٠/ ژ بەر چ ئەرستۆ ب گوپیتکا فەلسەفا یۆنانی دهێتە هژمارتن؟

پ ١١/ بەحسێ ئێك ژ فەلسەفێن یۆنانی پشتی ئەرستۆی بکە و ب هژمێرە، تایبەتمەندییێن فەلسەفا ئەوی ماوەی ژی دەستنیشان بکە.

## پشکا پێنجێ :

# دیرۆکا هزرا فەلسەفا ئیسلامی

# (ڕۆژهەلات و ڕۆژئاڤا)

### خواندنگەها ئەسکەندریە و ڕۆلێ هزریێ فەلسەفیێ وێ:

پشتی دامەزراندنا ئیمبراتوریا ڕۆمانی هەر ئێك ژ ڕۆژهەلات و ڕۆژئاڤا ئێكگرت د ئەنجامدا شارستانیەتا ڕۆژهەلاتێ دگەل شارستانیەتا یۆنانیان و ڕۆمانیان د ئێك قۆناغدا کو قۆناغا (یۆنانیا ڕۆژهەلات) وی دەمی ب (ئەسکەندەرییە) دهاتە ناڤکرن لێکدایەڤە، تێدا (ئایین و فەلسەفە)ە و (گیان و ماددە) ب ڕێکا پێککرنا دناڤبەرا کەلەپوورێ (کەلتوورێ) فەلسەفی و ئایینی دگەل ئەو فەلسەفا کو بەرەڤ دەڤەرا ڕۆژهەلاتا عەرەبی سەرهلدای تێکەلبوون. (خواندنگەها ئەسکەندەرییە) ناڤەندا هزرا فەلسەفی و زانیاریان بوو چەندین پەرتووکێن بناڤ و دەنگ ج دبوارێ نۆشداری و لۆژیك و گەردوونیدا تێدا سەرهلدان زێدەباری چەندین ڤەکۆلینێن دی یێن تایبەت ب زانست و زانیاریێ و فەلسەفێن هەمە جۆر، خۆدانێ ئەڤان هەمی زانست و زانیاریان ئاکنجییێن دەڤەرا ڕۆژهەلاتێ بوون و هەر ژ وێرێ ژی هاتینە سەر دونیایێ و ژ دایك بووینە و ل وێرێ بیروباوەرێن وان وەرارکریە. دیاردا ئاکارێن فەلسەفی، د ماوێ خواندنگەها ئەسکەندەرییە د اخۆ دنێرینا رژیانێ (الفیض) دا دیاردکەت ئەفلاتۆنێ مسری (٢٧٠ز) داهێنایە دناڤ پەرتووکا (نەهان) (التاسوعات)دا دارشتییە، گەردوون لسەر بنیاتێ گەردووناسی و ئایینی شرۆڤە کرییە. ئەگەرو هەڤبەندییا بێ سنوور یا دناڤبەرا (ئەگەرو ئەنجامان) د وی ماوەیدا لژێر بیروباوەرێ (ژ دایکبووناندا) هاتییە دامەزراندن ب هندێ کو ژ خودێ دەستپێکەت و ب ژێرێ ئێکێ و دەروونێ سەرتا سەر دەرباز دبیت و بدویف

دەروونێن گەردیلەیی و گیاندارێن ماددی ئێك ل دویڤ ئێكێ ژدایكبووینە هەتا وەكی کار لسەر ئەردی بكەن و هەر ئێك ژ ڤان گیانداران لدویڤ ئێكدوو دا ب حەزا خودایێ مەزن پەیدابووینە هەر وەکی چاوا تیشكا ڕۆژێ ژ ڕۆژێ تیرۆژكان ڤەددەت وئاڤ ژ كانیان و سەرۆكانیان دهەلاڤێت بڕێكەكا نێزیك ژ هزرا ئەگەرێ لدویڤ ئێكدا، هەروەکی چاوا د چارچۆڤێ (ژ دایكبووناندا) بەرنیاسە بەلێ د ڤێرەدا (تەكانییە) نەك (جووتە) و ژبەر هندێ دجیهانا (گەردوون)ی و دیرۆكا مرۆڤی و ژیانێدانە.

## فەلسەفە پشتی هاتنا حەزرەتێ (مەسیح) سلاڤێن خودێ لسەر بن:

فەلسەفە پشتی هاتنا حەزرەتێ (مەسیح) سلاڤێن خودێ لێبن ماددە دگەل سرۆشتی ئێكخست و (فەلسەفە) دگەل (شەریعەت)ی كرە ئێك هەتا كو بەرسڤدانەكا دروست بۆ نێرینەكا تەمام بدەتە دەست هەروەکی چاوا د ئیسلامێدا هەمان ئاكار دیار دبیت.

فەلسەفا كریستیانی (مەسیحی) بڕێكا ئەرستۆی و بڕێكا ئەفلاتۆنی، ڤەشە (ئوگستین)ی فەلسەفا ڕەوشتەیی (ئاكار) پێشكێش كر.

پشتی كەفتنا دەولەتا ڕۆمانی ل سالا (٤٧٨ز) ژبەر چەند ئەگەران ڕێكا مەیدانا فەلسەفێ بۆ چەند ڕێبازەكێن هزری یێن جودا جودا خۆشكر ڕۆلێ سەرەكی ڤەدگەریت بۆ چارەسەركرنا كێشێن (گەردوون)ی و كومەلایەتی ژلایێ زانایێن ڕۆژهەلاتی ڤە د چارچۆڤێ یەكێتیا ئاینیڤە كو ئاینێن جودا جودا بخۆڤە گرتینە.

ئەڤان زانایان هزر د گەردوونی و ژیانێدا دكر و بچاڤەكێ پڕ ژ ڤەكۆلینێ ژ چارەسەرییەكا سەرتا سەر د گەریان كو دبیت ئەگەر ب ڤێ نەبیت مرۆڤ چ جارا دەربازنابیت و سەنگا ژیانێ و كەسێن دهەڤبەندیێن مرۆڤیدا پشتی گونجاندنێ ناڤەگەریت زێدەباری ڤەگەڕاندنا پیڤەرێن ژناڤچوونێ و پێڤەرێن رەوشتی كو بڕێكا توندی و ستەم و زۆرداریێ دهێتە گۆڕێ.

## سێ: فەیلەسۆفێن موسلمان ل ڕۆژهەلات و ڕۆژئاڤای:

مەرەم ژ ئەڤان بشێوەکێ گشتی فەیلەسۆفێن ئیسلامینە ل دەڤەرا ڕۆژهەلاتێ و بشێوەکێ تایبەتی فەیلەسۆفێن بەغدا لوی دەمی بەغدا ل ناڤەراستا چەرخێ دووێ یێ مشەختی دا بوویە ناڤەندا سەرکردایەتیا ڕامیاری سەر ب جیهانا ئیسلامیڤە و بنگەهێ شارستانیەتا مرۆڤایەتی و جهێ دیدارا دناڤبەرا زانایان و فەیلەسۆفان و ژێدەرێن زانستی و زانیارێن چەرخێن لدویف ئێکداژی. بۆمە هەیە بەرهەمێن چالاکیێن باژێرێ بەغدا و کارتێکرنا وان بناڤێ (قوتابخانا بەغدایا فەلسەفی) ناڤبکەین، ملبملێ (قوتابخانا ئەسکەندەرییە) و (قوتابخانا ڕۆما) و (خواندنگەها ئەسینا) بەغدا کارەکێ بەرچاڤ د مەیدانا فەلسەفا ئیسلامیدا کریە و کاریگەریا وێژی لناڤ هندستانێ و پاکستانێ وئیرانێ و تورکیا درێژی هەبوویە و ل ڕۆژئاڤایێ ژی گەهشتییە ئەندەلوس، فەیلەسۆفێن بەغدا دپلە و پایێ خۆدا وەکو مامۆستا وخویندەڤانێن فەلسەفێ و زانیاریێ دهاتنە هژمارتن.

### ١- فارابی (ئەبو نەسرێ کۆرێ موحەمەدی ٥٣٩ك - ٥٩٠ز):



ب مامۆستایێ دووێ دهێتە ناڤکرن ژبەر کو ڤەکۆلینێن خۆ بشێوەکێ ژیری و هزری ڕێکخستبوون دەستەکێ بلند هەبوو د ڤەکۆلینێن فەلسەفی و زانیاری و زمانزانی و ڕامیاریدا، د بیاڤێ فەلسەفێ ژیدا جهێ وی ل ئاستێ ئەرستۆی (مامۆستایێ ئێکێ) یێ فەلسەفا یۆنانیە و گەلەك باش ژ فەلسەفا کندی و خویندکارێن خۆ ل بەغدا گەهشتییە و نڤیسینەکا بەرفرەهـ هەبوویە تێدا زانیاریێن فەلسەفی و سیاسی دگەل هونەری و پیشەی و مۆزیکێ کۆمکریە

دەربارەی گەردووناسی و مۆزیکا و نوژداری و بیرکاری و کیمیا نڤیسینێن باش هەنە و بسەدان بەرهەمێن فەلسەفێ و زانیاری ل پشت خۆ ژ بۆ خویندکاران بجە هێلاینە.

أ- فەلسەفا فارابی زانیاریێن گیانداران ژی دیار دکەت و لدویڤ شێوە و شێوازێن فەلسەفێ دەربارەی جیهانێ و ژیانێ د چارچۆڤێ (جڤاکی و سروشتی) و (جیهانیبوون)ێ دگەڕیا و گرنگی ب ژیربێژیێ (لۆژیک)ێ ملبملێ نڤیسینێن ئەرستۆی د ڤی باریدا ددا ڕەخنە دەربارەی لۆژیکا زمانی (منطق اللغة) دگرت سەرکەفتنەکا باش ب ڕێکا گرێدانا لۆژیکێ ب ڕێزمانێ ڤە بدەستڤەئینایە.

بناڤودەنگترین پەرتووکێن وی پێکهاتینە ژ (هزرو بۆچوونێن خەلکێ باژێرێ باش) (آراء المدينة الفاضلة) و (بدەستڤە ئینانا بەختەوەریێ) (تحصيل السعادة) (ئامارا زانستان) (إحصاء العلوم) ئەڤە پشتی هنگی بوونە ژێدەرەکێ زانیاری یێ فەیلەسۆفێن موسلمان و بیانی، موسلمان و نەموسلمانان مفا ژێ وەرگرتییە.

ب- جهێ شانازیێ یە بۆ فارابی کو ئێکە ژ وان فەیلەسۆفێن کو بکێمی دبێژن عیراقیێن کەڤن (کلدانی) ژێدەرێ دانا و فەلسەفێ نە و ژوانا ژی ژبۆ مسریان و بو یۆنانیان ڤەگوهاستینە ولدویڤدا ژی سەر ژنوی هەر ژبۆ موسلمانان ڤەگەریایە ڤە ب ڤێ ژی چالاکیێن ژێراتیێ بۆ نەژاد و ڕەسەناتیا شارستانیەتا خۆ ڤەگەڕاندیە نەك هەر وەکی چاوا هندەك کەس ب شاشی چووینە و کو ئەڤان چالاکیان ئێکجاری ددەنە پاڵ یۆنانیان بتنێ.

ج- دەرباری (زانیاریێن مرۆڤایەتی) و چالاکیێن ژیری دناڤ مرۆڤیدا، فارابی هەڤبەندی دناڤبەرا (پەیڤ)ێ و (هزر)ێ بەرامبەر (ڕامانێن وان) بەرامبەر جیهانا دەرەکی دبینیت.

فارابی وەسا دبینیت کو ئەنجامێ وەکی ئێك بوونا (تطابق) (تاکە و هزر) و (کەرەستێن ماددی) و ڕامانا هویر و کویر د ژیانێدا (زانیاریا ڕاستەقینە) بەردەست دکەڤیت و ب سەر چەند بابەت و ئاستەنگان دهێتە دابەشکرن ژ هەمیا گرنگتر:

١- زانیاریا هەستەکی ئەڤەژی یا تایبەتمەندە ب ڕویدانێن پشکێن ماددی د ڤێ جیهانێدا.

٢- زانیاریا ژیرێتی (المعرفة العقلية) ئەڤە یا گرێدایە ب بابەتێن (سەرتا سەری) و گشتی ئەوان ڤەکۆلینێن سەبارەت ب (سروشتی و چ هەیی ل پشت سروشتی) پێك دئینن وپایە دارترین پلا زانیارییێن مرۆڤایەتینە.

### ٣- غەزالی (ئەبو حامد کوڕێ موحەمەد):

أ- ئەڤ فەیلەسۆفە ب ڤەکۆلینێن ئایینی و قەسەزانی چویە سەر (زانستێ لۆژیك) و (فەلسەفێ) و د ڤەکۆلینێن خۆدا پشت ب بەرنامێ خۆ کو دبێژنێ (بەرنامێ گومانێ) گرێدایە دەربارەی (ڤەژاندنا زانستێن ئایینی) و (ئارمانجێن فەلسەفێ) و ب پەریشانبوونا فەیلەسۆفان و زانستێ لۆژیك نڤێسی یە هەتا دگەهیتە پەرتووکا (ڕزگارکەرێ ژ سەرداچوونێ) (النقذ من الظلال) غەزالی هەر ئێك ژ (هۆش) (العقل) و دەقێ شەرعی کریە ڕێبازەك بۆ گەهشتنا ڕاستیان وهەر ئێك ژ وان ڕێبازان بوارەکێ خۆیێ تایبەت هەبوو و نابیت گرۆڤێن هۆشی ل بابەتێن (خوداوەندی) ب کاربینیت پشتی کو ڕێکا ڤەکۆلینا زانستێ سروشتی بۆ هوشی بوو هەر دەمەکێ ژی کو بریارەکا هۆشی دگەل شەرعیدا دەربارەی خوداوەندان نەگونجابا ئەوا غەزالی د گومانێدا دڤییا بگەهیتە ڕاستییێ و ڕازی نەدبوو ڕاستییان هەر وەکو چەوا هەین ل ئێکەم شاشیێدا وەربگریت ب ڤێ ژی بەرنامێ غەزالی دەربارەی ئایین و زانینێ دگەل سروشتی و خوداوەندی جودابوویە.

ب- ئەبو حامد دگەل ئەو فەیلەسۆفێن کو بڕێڤەبەریا و جهێ فەیلەسۆفێن یۆنانی سەبارەت ب (کەڤناتیا ماددەی) نەك ئافراندیبوون نەتەبابوون و باوەری ب سنۆرداریێ ل زانیارییا خوداوەندی هەر وەکو چەوا فەیلەسۆفان وەسا هزر دکر نەبوو دگەل وان سەبارەت ب (ڤەگەڕاندنا گیانی) ب تنێ بێ (ساخبوونا لەشی) (لا البعث الجسدي) رێکەفتی نەبوون بابەتێن خوداوەندیێ دپەرتوکا خۆدا (تهافت الفلاسفة) گرێدای ب بریارا (هۆشی مرۆڤایەتی کێم تێگەهشتن ب نهێنیێن جیهانێ) نەبوو بەلێ ئەڤە یا تایبەتمەندە ب (دەقێن پیرۆزێن ئاخفتنێن پێغەمبەرێن پایەدار).

بۆ نموونە باوەری بوون ب پیرۆزیا راستییا خوداوەندی ل ناڤەرۆکا دەقێن پیرۆز وەردگریت و دویر ژ دانوستاندن و ڕاوبوچوونا فەیلەسۆفان ئەوا سەبارەت پێڤە.

ج- غزالی ل بەغدا ناڤدار و بەرنیاس بوویە.

د- ل دوماهیك ژۆژێن ژیانا ویدا ڕووی کریە دەروێشیێ و بەغدا بۆ حەجکرنێ ب جە هێلایە وبۆ ماوێ دەه ساڵان ل شامێ مایە ول دویف ژیدا روی کریە جهێ سەرکەفتنا خۆ ل باژێرێ (طوس) ل وێرێ پشتی هێرش و ڕەخنەگرتنا خۆ ل سەر فەلسەفێ و فەیلەسۆفان دەستهەلگرتی ل ساڵا (٥٠٥ مشەختی) چوویە بەر دلوڤانیا خودێ.

## دوو : فەیلەسۆفێن ڕۆژئاڤا یا ئیسلامی :

بیروباوەر ل (ژووریا ئەفریقیا و ئەندەلوس) ل پێشڤەچوونا شارستانیا ڕۆژهەلات نەهاتینە برین، ئەڤە ژی ڤەدگەریت بۆ پەرەپێدانا پیشەیا (نڤێسین و پەڕان) و بازرگانی کرن ب پەرتووکان، بەرهەمێن فەیلەسۆفێن ڕۆژهەلاتی ل بەردەستێ خوێندکارێن ڕۆژئاڤا بوویە و هەردەم سەرەدانا دەڤەرا ڕۆژهەلاتێ و

سەرەدانا جهێن ئایینی وپەیوەندی گرێدان ب ڕۆژگارێن زانستی و فێربوون ژ زانایان و دانایێن دەڤەرێ هیڤی و ئومێدێن فەیلەسۆفێن رۆژئاڤای بووینە. و دیارترین ڕوخسارێن پێشکەفتنا شارستانی د ئەندەلوسدا ل (٣٦٦ مشەختی/ ٩٧١ ز) سەرهلدایە و د وی سەردەمیدا پەرتووکێن فەلسەفێ و زانستی ل ڕۆژهەلاتێ بۆ ئەندەلوس ڤەگوهاستینە وئەڤ ولاتە بوویە بنگەهەکێ خواندەڤانێن بیانی و ئەوروپی ل سەر دەستێ فەیلەسۆفێن ئیسلامی ل ڤی ولاتی فێربوون، ئەگەر بێتو دەهان ژ فەیلەسۆفێن ڕۆژئاڤایێ بێخنە لایەکی ئەڤجا دڤێت ل بەردەمێ (ئیبن ڕوشد) هەتا دگەهینە (ئیبن خەلدون) ب ڕاوەستین چونکی ئەڤ شونوارێ چالاکیێن فەلسەفی د وی چارچوڤەیدا یێ بەرچاڤ و بەردەستە.



### ١- ئیبن ڕوشد (ئەبو ئەلوەلید کوڕێ ئەحمەدیە):

ژ نوشدارێن قوورتەبە بوو و ب ناڤ و دەنگترین فەیلەسۆفە ژ فەیلەسۆفێن ئەندەلوس، هندەك کەسان (ب گوپیتکا خواندنگەها ئەندەلوس) ناڤ دکر مل ب ملێ پلە و پایێ فارابی د خواندنگەها بەغدادا.

#### أ- کاریگەریا وی:

ب ڕەخ ڤەکۆلین و پوختەیێن وی بۆ پەرتووکێن ئەرستۆی چەندین بەرهەم دەرباری (بەرنامە) و (زانیاری) هەبووینە ومانا خۆ بۆ بەرڤانیکرن ژ (فەلسەفا فەیسلەسۆفان) و (هزرکرنا فەلسەفا زانیاریا سەربەست) تەرخان کربوو.

(ئیبن ڕۆشد) فەلسەفا ب ژیریەکی ل دویڤ پوختەیا پەرتووکێن ئەرستۆی تۆمارکربوو هەر وەکو چەوا فەیلەسۆفێن ڕۆژهەلاتی ژی دەربارەی شرۆڤەکرن و

ڕەخنە و ڕونكرن سەرەدەری دگەل (پەرتووكێن ئەرستۆ)ی كری. (ئیبن ڕوشد) سەبارەت ب ئایینزانی و فەلسەفە و ڤەدیتنا بەرنامێن گرۆڤان وجوداكرنا ڕاپۆرتا وی دانا وشەریعەتێ نڤێسییە وەك ڕەنگڤەدانەك هەمبەر پەرتووكا (فەیلەسۆفان) یا غەزالی.

سەبارەت ب فەلسەفێ ژی ڕاستیا بیروبوچونا خۆ دەربڕیە و نڤێسینێن وی دەربارەی پوختە و پەرتووكێن ئەرستۆ و ئەفلاتۆن بوویە.

## ب- بەرنامێ وی:

دان پێدان بسەرفەرازیا هۆش ودانایی د بیاڤێن هزر و كاركرنێ بوویە بنیاتێ بەرنامێ وی دناڤبەرا موسولمانان پەسەندە و پەیڕەو كریە د ڤی بیاڤیدا (ئەبو وەلید)ی دگوت (ئەگەر هاتوو ئاییناس ل دان پێدانێ یێ ڕاست و ڕەوا بوو ئەڤێ دوو باشی بۆ هەنە و ئەگەر خەلەتی ژی كر ئەڤێ باشیەك هەیە) د ڤێرەدا (ئیبن ڕوشد) هەمبەر دژاتییێن فەلسەفێ دراوەستیت ودبێژیت ژیر ژ دانایان باشترن ئەگەر خەلەتییێ ژی بكەن) ئەڤەژی دان پێدانەكا شەرعییە ب ڕۆلێ فەیلەسۆفان دگەڕیانێدا ل دویڤ چارەسەركرنا وان جۆرە گرفتان كۆ بەرسڤەكا ڕوون و ڕەوا بۆ نینە، ب ڤێ پیڤانێ ژی دڤێت ژیرا خەلات بكەن سەبارەت هەڵسەنگاندنا ڤەكۆلینێن فەلسەفا ئیسلامی هەروەسا پشت ب هەمان بنیاتێ سەرەدەریكرنێ دگەل بەرهەمێن فەلسەفێ گرێدایە ودبێژیت (دڤێت خەلات بۆ زیرەكی بیت هەرچەندە خەلەتییێ ژی بكەت) هەتا مەیدانا وی یا فەلسەفی و فەیلەسۆفان ژ تومەتێن دژی وی بێ گونەه ببیت.

## چ- ئارمانجا وی:

بەرنامێ (ئیبن ڕوشد) كو (ژیری و سەربەستی و زانست و زانیاری و زیرەكی) ل

دەربڕینا بیروبوچونا بنیاتێ وێ بوویە دڤیا هەڤبەندییێ دناڤبەرا (فەلسەفێ) و (ئایینی) ئاڤەدان بکەتە ڤە پشتی ئەڤ جۆرە پەیوەندیە تووشی خرابیێ بو.

## د- فەلسەفا وی:

(ئیبن ڕوشد) وەسا دبینیت کو دڤێت فەیلەسۆف ب گرێدانا تشتان ب گرێدانەکا ئەگەری گرنگییا وێ یا باوەری پێدای بیت و ئەنجامێن وێ بۆ ئەگەرێن وێ ڕابکێشیت و ب ڤێ پەیوەندییێ و لایەنێن وێ دەرفەتا (زانیاریا ڕاست) بکەت دەمەکی ئەڤ پەیڤەژی گوت وەك ڕەنگڤەدانەك بۆ غەزالی دەمێ دان پێدان ب هەبوونا ئەگەری (السببية) نەکری و ئەشعەریان کو (غەزالی) نموونێ وان بوو ئەوان ژی دان پێدان ب هەبوونا (ئەگەرێ سروشتی) دناڤبەرا تشتان نەکر، یێ گونجای نەبوو کو ئەڤە بنیاتێ (زانست و زانیارییێ).

هەر ژبەر ڤێ ژی (ئیبن ڕوشد)ی بەرەڤانی ژ فەیلەسۆفان دکر وتومەتێن غەزالی دژی فەیلەسۆفان ڕەت دکرن ب تایبەتی دەربارەی زانیارییێن خودێ و کەڤناتیا جیهانێ ودگۆت: خودێ ژ وێ مەزنترە کو ل زانیارییێن وی ب شێوەکێ پشکی و یان ب تێکڕایی لێ بگەرییێن و ئەو سەلماندن کو زانیارییێن خودێ وەکی زانیارییێن مە نینن هەتا بهێتە پیڤانەکرن ب ڤێ ژی تۆمەتێن غەزالی چ ڕامانەك بۆ نینە هەروەسا (زانیاریا خوداوەندی) ژی ب شێوەکێ گشتی لێکدانە ڤە ب وێ کو هەمی ژ زانیارییێن دیتر دچنە بن ڕکێفێ وێ سەبارەت ب کەڤناتیا تشتان و پەیدابوونا وان وەسا بۆ دچوو کو ئەڤە بتنێ زیرەکییە و چ ژ شیانێن خوداوەندی کێم ناکەت . . . چونکی موسلمان دبێژن کو خودێ دروستکرینە و ڕێکخستینە و لڤین یا دایێ.

(ئیبن ڕوشد) وەسا دبینیت کو (زندیبوون) د پاشەڕۆژێدا (گیان و لەشی)

ڤەدگریت بەلێ وەسا ژ شێوێ ژیینا نهو یا مرۆڤی ل سەر دونیایێ ناچیت بەلکو ئەڤ ژییانە یا گونجایە دگەل ڕاستیا کارێ مرۆڤی و رەفتارا وی ل سەر دونیایێ دبیت ژ لایەکێ دیڤە دگەل ناڤەرۆکا ژیانا دوێ و مەرجێن میتافیزکیان هەر وەکو چەوا خودایێ مەزن تایبەتمەندییێ ددەتێ.

هەر چەندە فەیلەسۆفان دەربارەی ڤەکۆلینێن خۆ سەبارەت ب (سروشتی) یان (خوداوەند) ژ ئێك جودانە بەلێ هەمی ل بازنا ژیری دەناکەڤیت وخودانێ ژی نائیخیتە دناڤ بازنا شەرمزارییێ و هزرکرنێ دا، بڤی شێوێ (ئبن ڕوشد)ی رێکا راپەراندنا هزرو بەرنامێ خۆ ژ دەولەتێن ژووریا ئەورۆپا سازکریە، پشتی کۆ کۆمەلا ئیسلامی ژبەر چەند ئەگەرێن ڕامیاری پشتی کەفتنا بەغدا و ل دویڤ دا ژی کەفتنا غەرناتە هاتیە ڤەکێشان ول شارستانییێ هاتیە دابڕین و پاشکەفتی بوو.

## ئیبن خەلدۆن

## وەلیە دینێ کورێ عبدولڕەحمانێ کورێ موحەمەدێ تونسیە

جیهان وەسا هاتیە بەرچاڤێن ئیبن خەلدۆنی کو مەزنترە ژ وێ (هۆشێ مرۆڤی) بۆ بچیت، ئیبن خەلدۆنی وەسا هزر دکر کو دروست نینە ژ هەر تشتەکی دناڤ جیهانێ و ژیری و ئەزموونێ بتنێ دویر ژ (شەرعی) بکەت! ب رامانەکا دی سەرجەمێ زانیارییێن پێگەهشتی (لۆژیك ژیرە) کو ل ئەزموونێ دبنە بناغەکێ سەرەکی یێ ڤێ هەبوونا ئالۆز.

**أ- فەلسەفا وی:** فەلسەفا خۆ ژناڤەڕوکا پەرتووکا خۆ یا بەرنیاس (دەسپێکا ئیبن خەلدۆن) (مقدمة ابن خلدون) پۆختە کریە ودەمێ کۆ ڤەکۆلینێن وی ل بەرتەنگیێن کەفتنێ (محنة السقوط) و ئەگەرێن ڕاپەڕینێ (أسباب النهضة) ل مەیدانا (کۆمەلزانی) و (دیرۆکا فەلسەفێ) ئێخستە بەرچاف بەحسێ کورتیەکا

دیرۆکا فەلسەفێ و لۆژیکی بۆ خویندکاران کریە و ل ڕێیا داکوکی ل باشماوێن خرابێن قۆناغا ڤەکێشانا سیاسی و هزری دکرن کو ل ئەنجام بوویە ئەگەرێ (کەفتنا بەغدا ل سالا ١٢٥٨ز) پشتی وێ فەلسەفا ئیبن خەلدۆنی رووی کریە خواندنا (ئەزمونکاریا مرۆڤایەتی) ئەو ژی ل چارچوڤێ عەرەبی و ئیسلامی هەتا کو ئەنجام بگەهیتە وێ یاسایێ کو ڕویدان شرۆڤە دکەن وەك ئەنجامەك ژ (ئەگەرێن وێ) نەهێتە جوداکرن، ب ڕامان کو ڕویدانێن دیرۆکی ئەنجامن وب ئەگەرێن دویر و نێزیك و ئاشکرا و ڤەشارتی دهێنە گرێدان.

مرۆڤێ ژیر (دانا) دشێت ل تۆراخویا پەیوەندیێن ڤەشارتی ل دویڤ تشتان بکەت و ئەنجامێن خەلەت دوبارەنەکەت ئەڤە ژی (فەلسەفا دیرۆکێ یە).

(ئیبن خەلدۆن) ل ڤەکۆلینەکا تایبەت ل سەر ئەگەران دبێژیت (هەر تشتەکی ئەگەرێ سروشتی هەیە وزنجیرا ئەگەران دگەهیتە ئێك ئەگەر (خودایێ مەزنە).

ب- جهێ شانازیێە بۆ ئیبن خەلدۆنی کو بەری زانایێن ڕۆژئاڤا ل (کۆمەڵزانی و فەلسەفێ و شارستانیەتێ و دیرۆکێ) ڤەکۆلییە و کارتێکرنەکا ئاشکرا ل سەر ئەورۆپا هەبوویە لەورا ژی ب دەسپێکا سەرهلدانا دیرۆکا نویا نەتەوەیی یا عەرەبی دهێتە هژمارتن.

ج- (ئیبن خەلدۆنی) پشکداری ل سازکرنا بیردۆزا پەرەپێدانێ کریە و مفا ژ بیروبوچونێن فەیلەسۆفێن عەرەبی و ئیسلامی یێن بەری خۆ وەرگرتییە.

بیروباوەرێن (وەلیە دینی) سەبارەت ب سیاسەت و دەولەت و شارستانیەتێ و خەلکی بوویە ژ دایکبوونێ وگەنجاتیێ دەست پێدکەت وب پاشکەفتن و کەفتنێ و پیراتیێ دبۆریت وب مرنێ ب داوی دهێت، ئەڤ لڤینە و گوهۆڕینە ژ وان مەسەلانە وەك چەوانیا (دەسەلاتداری و ئابووری) زانست و زانیاری جودانەکریە هەروەسا

یاسا هێزا جڤاکی وئێکگرتنا وی و پێشکەفتنا شارستانیەتا وی ڤەدگەریتە ڤە بۆ توندیا (العصبیة) ئێکگرتنا کۆمەلی و باشیا بارێ ئابووری و بەرهەمێ زێدە ژی بۆ خزمەتگوزاری و پەرەپێدانا شارستانیەتێ دهێتە بەرهەڤکرن.

دەمێ (ئیبن خەلدۆن)ی ئێش و ئازارێن پاشکەفتنێ و هەڤرکیێ و نەتەباییێ دناڤبەرا عەرەبان دا ددیت خەلك ب وێ ئاگەهدار دکر کو عەرەب نەتەوەیەکێ خودان شارستانیەتەکا ڕەسەنە و ڕە و ڕیشالێن وان دکویرن هەر دەمێ بارێ وان باش بیت دشێن سەروژنوی دەرفەتێ بگونجینن و پاشکەفتنێ و ژێکڤەبوونێ ب داوی بینن و پێنگاڤا بەرەف پێشڤەپاڤێژن.

(ئیبن خەلدۆن) سەبارەت ستەم و زۆرداریێ ول دویڤکەفتنا بیانیان و نەفامی و هەڤڕکی و نەتەبایی کو د وی سەردەمیدا یا بەلاڤ بوو گەلەك پێ بێزار بوویە وئەو چەرخ ژی ب چەرخێ عەرەبی نەناساندیە! چونکی ئەو ژناڤەرۆکا ئایینی و ڕەوشتێن باشێن موسلمانان و ئایینێ ئیسلامی نەگەهشتبوون ل دویڤ ڤێ (ئیبن خلدۆن) بوویە ئێك ژ ناڤدارێن عەرەبی و جیهانی وشیاییە یاسایێن لڤینا جڤاکی و فەلسەفا ژیانێ دابنیت و ل پشتی وی ژی چ کەسان ل دەڤەرا ڕۆژهەلاتێ و ڕۆژئاڤای فەلسەفا وی پێشڤەنەبریە و پێنج سەدەیان پشتی وی (فەلسەفە) و (جڤاك)ی بارێ داکێشانێ بخۆڤە دیت.

## پرسیارێن پشکا پێنجێ

پ ١/ زانایێن ئاخفتن ناسی چ ڕۆل ل بەلاڤکرنا هوشیاریا فەلسەفێ هەبوویە.

پ ٢/ جوداهی دناڤبەرا ئاخفتن ناسی و فەلسەفا فەیلەسۆفێن ئیسلامی چیە؟

پ ٣/ ئەگەرێ دامەزراندنا فەلسەفا ئیسلامی چیە؟

پ ٤/ فەیلەسۆفێن ناڤودەنگێن ئیسلامی چ کەس بووینە؟ ل سەر دو ژوان باخڤە.

پ ٥/ مەرەم ژ فەیلەسۆفێن ئیسلامی یێن رۆژئاڤا چیە؟ و ڕۆلێ ئیبن خەلدۆنی ژی د فەلسەفا دیرۆکی دا چیە؟

## پشكا شەشێ

# هزرا نویا ئەوروپا ل سەردەمێ ڤەژاندنا ئەوروپا و هندەك ئاكارێن فەلسەفی یێن نوی

### ئێك: هزرا ئەوروپی د چەرخێ نویدا:

١- ئەگەر تێبینیی یا دیرۆكا فەلسەفا كریستیان (مەسیحیەت) د چەرخێ ناڤەراست و چەرخێ راپەرین (النهضة) و هۆكارێن سەرهلدانا ڤێ ڕاپەڕینێ (٤٠٠ هەتا كو ١٦٠٠ز) بكەین دێبینین چەوا فەلسەفا یۆنانیان گەشەكریە و چەوا فەیلەسۆفێن كەڤنێن یۆنانی بنیاتێ فەلسەفێ دامەزراند و پرسیار و ڤەكۆلین سەبارەت ب بابەتێن سەرەكیێن فەلسەفێ وەك جیهان ومرۆڤ و زانیاری وبیروباوەر و هەروەسا بهایێن ڕەوشتی و جوانییێ دئێخستە بەرجاڤ هەروەسا پێشنیارا چەندین چارەسەرییێن جودا جودا بۆ كێشان دانانە.

ل داویا چەرخێ یۆنانی ورۆمانا كەڤن، ئایینێ كریستییان (مەسیحیەت) ل سەرانسەرێ جیهانێ بەلاڤبوویە د وی دەمیدا دیرۆك نڤیسێن ڕۆژئاڤای ب چەرخێ ناڤەڕاست ئەو سەردەم ب ناڤكربوو ژ سەدەیێ پێنجێ هەتا سەدەیێ چواردێ درێژی هەبوو و بسەر دوو ماوان دا دابەش كربوو:

**ئێك ژ وان سەردەمێ زوی (پێشوەخت) و یێ دیتر سەردەمێ پاشتر (پاشكەفت)**

سەبارەت ب وێ ب ڕێیا وێ شارستانیەتا یۆنانی هاتە ڤەگوهاستن بۆ ڕۆژئاڤایا لاتینی. بەری ڤێ چەندێ مە روهنكریە كۆ چەرخێ ناڤێن د ئەورۆپادا لایەنێ ئایینی بەسەردا كێشابوو وهندەك شێوازێن نوی ل فەلسەفێ و كۆمەلایەتی و ئابووری كو كەنیسە تەوەرێ و یێ سەرەكی بوو پەیدابببوون، د وێدا ژی چەند هۆكارێن ناڤخۆیی یێن بنبڕ هەبوون پەیوەندی ب دامەزراندنا جڤاكێ ئەورۆپی ڤە

هەبوو، وەك ڤەدیتنێن جوگرافی وهەوا خاچ پەرستان، گەشەکرنا بازرگانی دگەل رۆژهەلاتێدا و سەرهلدانا باژێران و ئاکنجیێن دەولەمەند و کەلەکەبوونا سەرمایێ و هڤرکی دناڤبەرا میرو شاهان دا ژ لایەکی ڤە ودناڤبەرا دەرەبەگ و کەنیسێ دا ژلایەکێ دویڤە و زێدەباری مشەختبوونا زانایان بۆ ئیتالیا پشتی دابەش بوونا ئیمپرا تۆریەتا رۆمانی و کەفتنا (قوستەنتینییە) ل سەر دەستێ دەولەتا عوسمانی ل سالا ١٤٥٣ز و بزاڤا چاککرنا ئایینی، و دەستکێشان ب سەر پێشڤەچونێن ئابوریێن نوی ژ لایێ رێباوەرێن پرۆتستانتان ڤە ودانا قازنج و حۆشییێن ژیانێ ب نیشانا رازیبوونێ دژی کاریگەریا رێباوەرێ (دەست هەلگرتنا ژیانێ) یا کەنیسا کاثولیك، و هندەك ئەگەرێن کاریگەریێن دی ژی هەبوون ژ وان بواران، وەك داهێنانا چاپ و باروت و قیبلەنامێ ئەڤان هەرسێ داهێنانێن داویێ رۆلەکێ مەزنتر د دروستکرنا دیرۆکێدا هەبوو زێدەتر ژ رۆلێ رامیاری یان داگیرکرنا و هەڤرکیا ئایینی، هەر وەك (فرنسیس بیکۆن) گوتی ژبلی وانا بزاڤا ویژەیی ژی کو (ڤەژاندن) یان (راپەرین) ب ناڤ دکرن، ئانکو ڤەژاندنا وێژە و فەلسەفا یۆنانی یا کەڤن کو ب ئاشکرا ژ یا نوی خواز  وزێدەباری رەخنا هزری رۆل د ڤەکۆلینێدا هەبوویە، و ناڤێن وان ب بەلاڤکرنا رەخنە و گومانێ و هاتن، و فرەنسیس رەبەنێن دێرا بوون کو مژویلێ ئەزموونێن زانستی بوون ب حێبەتی بۆ وان دەرکەفتبوو چەوا تشتێن سروشتی جۆرە مەزناتی وتام هەیە ئەوان و ئەڤان رۆل د پەیدابوونا هزرکرنا زانستی یا نوی دا هەبوویە.

ب ڤی شێوەی تۆڤێ رۆشەنبیری ب هزرەکا نوی دەست پێکربوو، زمانێن نەتەوەیی پێشڤەچوون و ساماندارى پوخت پتربوو ببوونە زمانێ وێژەیی و هونەری و چاپ ژی بۆ بەلاڤکرنا زانیاری بەرفرهەبوو وئەڤە دگەل گیانێ بازرگانی هزرێن کەساتیا نەتەوەیی ئینا گۆڕێ ب نەهێلانا وان ئاستەنگان کو گوندێن ڤەدەر

ژ ئێك دابریبون كو ژ لایێ ئابووریڤە ل دویڤ ڕامیاریا (پشت گرێدان ب خۆ) دژیان. بەرنامەكێ زانستییێ نوی دەستپێكربوو ڕێیا خۆ كەت وەلێ هات نەشیان دبوارێن زانست و ناسینا سروشتی ب دەسەلاتا كەنیسێ ب ڕاوەستن داخوازا ڤەكۆلینا تشتێن سروشتی ب شێوەكێ ڕاستەوخۆ نەك بتنێ ژ نڤێسینان، بەلكو ل سەر بنیاتێ تێبینیكرنا سروشتی و دیاردێن وێ و ل سەر بنیاتێ ژێری پشكینەر یێ موكم بوو. وەلێ هاتبوو ل هەمی ئەو ولاتێن كو سیستەمێ سەرمایەدارییێ نوییێ چالاك تێدا پێشكەفتنەكا بنەڕەتی ل زانستێن سروشتی و جوگرافی و دیرۆك و كۆمەلایەتی و هونەری و هزرێن ڕامیاری لێ پەیدابیت، ئەڤ دەربرینە هوشیاریا مرۆڤایەتی هەمی ل بن كارتێكرنا پێگەهشتنا پیشەسازی وبازرگانی و كۆمەلایەتی هاتنە گوهۆڕین. دیارترین تایبەتمەندییێن ئەوی سەردەمێ نوی پێداچوونا ناسینا مرۆڤی وب ئاگەه هاتنا كەساتیا تاكە كەسی كو ل ناڤ جڤاكی وتێكڕاییێ كەنیسێ و دەرەبەگایەتی بەرزە ببوو. ئەو ئەركێ ل زانست و فەلسەفێ و هونەری وێژەیی دڤییا، ببوو ئەركێ ناسینا جیهانێ و مفا وەرگرتنێ ل هەر تشتەكی بۆ زێدەكرنا ساماندایا ژیانێ.

## سالۆخەت و دەرئەنجامێن ئەڤان پێشكەفتنان ل سەر زانستێ نوی و فەلسەفا نوی:

ئەنجامێن ئەوان پێشڤەچونان ب سەر زانستێ نوی وفەلسەفی و ئەو پێشڤەچونێن مەزن بووینە ئەگەرێ گوهۆرینا تێگەهێ (ناڤەندێ ئایینی) دەرهەق ب زانست و فەلسەفێ بۆ تێگەهەكێ نوی ب فەلسەفا نوی ناڤدكر یان ب چەرخێ نوی كو ماوێ وێ دناڤبەرا سەدەیێ هەڤدێ هەتا سەدەیێ نۆزدێ ڤەدگریت وب چەرخێ (ڕاپەڕین) یێ بەرنیاسە دشێن لێنێرینەكا نوی ل سەر زانست و فەلسەفێ ب ڤی شێوەی كورتبكەین:

١- ئەڤ لێنێرینە گرنگیێ (ب ڕویدان) و زانستی ددەت، هەروەسا بەلگەنامێن خۆ ل سەر مەگرتیێن وەسا دامەزراندیە کو دڤێت ب تێبینی وئەزموونا بهێنە ساخکرن ب بەروڤاژیا فەلسەفا سەردەمێن ناڤین.

٢- پێکۆلا شروڤەکرنا کێشان دکەت ب ڤەگەریان بۆ (ڕویدانا نموونەیی) نەك ب ژیری، ب بەرۆڤاژیا ئەوا ناڤەندی کو ب ژیربێژی ڕێنمایی دکر و پابەند ب ئەزموون و تێبینیێ و لێنیرینێ نەبوو.

٣- نابیت گرنگیێ ب جوداهیا پەیف و فێلێن لوژیکی بدەت هەر وەك سەدەیێن ناڤین ل دویف پێدڤییێ پەیرەو دکر.

٤- بتنێ هەتا ڕادێ نوقمبوونێ گرنگی ب ڕابوری بدەت، چونکی نە ڕابۆری گەلەك ل پێشیێ یە هەتا بزانیت، ب ڤی شێوێ ل پابەندێن ئایینێ و هزرێن دا سەپاندنێن کەنیسێ ب سەر فەلسەفێ و زانستی و هزرێ د چەرخێ تاریدا ڕزگاربوو.

٥- ڕووی کریە ئەڤێ جیهانێ و ساماندارکرنا وێ بەلێ فەلسەفا ناڤەندی دهات بێختە پشت گوهاڤێتن ژ پێخەمەت جیهانا پشتی مرنێ بێ کو ئەو لێنێرینا نوی یان چەند لایەنێن جیهانێ پشتی مرنێ ژی ژبیر بکەت و گرنگیێ ب مرۆڤی بدەت ودان پێدانێ ب شیاندارێن هۆش و ئەزمونێن مرۆڤی بکەت بۆ زانین دەربارەی جیهانێ.

٦- باوەری ئینان ب جیهانێ و مروڤێن باش بسەلمینن، ئەڤە ژی لێنێرینەکا نویە ب بەروڤاژیا لێنێرنا سەدەیێن ناڤەڕاست کو پشکا زۆر باوەری ب وان خرابییان ئینا کو دناڤدایە و ژێ ڕزگار نابیت ل ژیانا ل سەر ئەردی ئەڤە هەر وەك ل ئاراستێن (ئۆگستین) ئاشکرایە.

٧- بکارئینانا بەرنامەکێ نوی ل زانستێن سروشتی و ڤەکۆلینا وان دیاردێن کو ل سەر یاسایا دەرهێانێن زانستی ژ لایێ (فرەنسیس بیکۆن)ڤە.

هاتیه دامەزراندن، هەروەسا راوێژکرنا ژیری و هاڤێشتنا هەر تشتەکی بۆ ڤەکۆلینا ژیری ژ لایێ (دیکارتی)ڤە کو بەرنامێ ئەزموونکاری یا (بیکۆنی) پێ تەمام کریە و توخمێ ژیری دا زانستیدا ئێخسبوویە پشت گوهاڤێتن ئەو توخمێ کۆ پەیرەو و یاسایا پشت ب دیاردان دەرئێخیت بڤی شێوەی هەردوکان ب تێگەهشتنا سروشتی وتەرخانکرنا ڤەکۆلینێ بۆ ب کارئینانا وێ ژ پێخەمەت پێشکەفتنا ژیانێ ودەولەمەندکرنا مروڤی، وەلێ هات هەمی جیهانا کەرستەیی و ژیری مل کەچی تێبینیێ وئەزموونێ بیت، ڕوی ل ڤەکۆلینا بنەجها زانینا تشتان دکر، مرۆڤی دەست ب پرسیارێ کریە: نەژادێ زانیاری وتێگەهشتنێ چیە ژێدەرێن وان چنە ژیریە یان ئەزموونە، د ڤێرەدا بیردۆزا (ئەزموونکاریان) ل ئینگلتەرا ل سەر دەستێ (بیکۆن و جۆن لۆك و دیڤید هیۆم) دەرکەفت کو گوتیە زانیاری ل ئەزمونکاریێ هاتیە وەرگیران و بیردۆزا (ژیری) ل ولاتێن دیێن ئەورۆپی کو ڕابەرێ وێ (دیکارتە) و پشتی وی ژی (لایتبزو سپێنوزا) بوو، دبێژیت بنیاتێ زانیاری ژیریە. ژیری و ئەزمونکار کو ل نەژادێ زانیاریان ڤەدکۆلیت هەردوکان باوەری ب ژیریا مرۆڤ و تاوانا وی هەبوو بۆ زانینا تشتان، چ ژ هەردوکان توخمێ بابەتی (شییانا زانینا تشتان) ژێك نەدکەفتن و ئەرێ ژیری شیانا پەیداکرنا زانیاریان هەیە وسنورێ زانینا مە چیە؟ هەتا (کانتێ) ئەلمانی هاتی و ڤەکۆلین بۆ زانیاری ئارستەکری ڤەکۆلینا شیانا زانیاری ئینایە بەر ڕێباوەرا خۆ کو ناڤێ وێ (فەلسەفا ڕەخنەکاری) بوو.

## ئێك: ڕێباوەرا ژیری:

ڕیباوەرا ژیری یان ژیری وەسا هزر دکەت کوهۆش هەر بخۆ بێ ئەزموون ل ڕاستیا جیهانێ دگەهیت شیاندایا ژیرێ مرۆڤی (بەری ئەزموونان) ڕادبیت ب ڕێکخستنا ڕاستی و زانیاریان هەتا دگەهیتە چەند ڕاستیەکێن نوی.

ئەڤ ڕێباوەرە دوێ باوەریێ دایە کو هندەك بیروباوەر د هۆشی دا بخۆ بەری ئەزموونان هەنە وژێ دسەربەخۆنە وگەلەك گرنگن و باوەریا وی ئەوە (گشتی ژ بشکێ مەزنترە) ئەڤە ژی پشتێ ب زانیاریا بیرکاری گرێ ددەت وەکی نموونەکێ دڤێت ڕاستیاوێ ژ فەلسەفێ دەربێخێت. ڕێباوەرا ژیری وەسا دبینیت کو ژیر هەر. ب خۆ بتنێ خورستیە بۆ هەمی زانیاریان ب سەر زانیاریا ئەزموونکاری ژوێ دویرە فەیلەسۆف دیکارت ژی نوینەرەکێ ڤێ ڕێباوەرییە.

### دیکارت:



فەیلەسۆف و زانایەکێ فەرەنسیە گەلەك گرنگی ب زانیاریێن سەردەمێ خۆدا بوو ب تایبەتی بیرکاری ب شێوەکێ سەرەکی پویتە ژی ب زانیاریا لەشی و فیزیا و زانستێن دی.

(دیکارت)ی وەسا هزردکر کو ئێك زانست هەیە ئەو ژی فەلسەفەیە و چەند لقەکێن هەڤپشك ژێ پەیدا بووینە د وێ باوەریێ ژی دا بوویە کو ئێك زانیاری هەیە ئەو ژی زانیاریا ژیریەیا ڕاست و ڕەوانە و دگۆت پرۆگرامێ زانیاری ئێکە و ژ وێ زانیاریێ دشێین ڕژێمەکا تەماما زانیاریێن دی دابین بکەین کو بشێن دیاربکەن.

(دیکارت) ب گومانکرنێ ژ مسوگەریێ هەمی زانیاریان دەست پێدکەت، نەژیری

و نەهەست دگەهنە مسۆگەریێ، چونکی جار هەیە هەست بهێتە خاپاندن، دبیت هەردەم مەبخاپینیت و ژیری ژ ئەنجامێ دەرئینانان شاشیان دکەت. ئەم چاوا بزانین هەمی ب وی شێوەی نینە ئانکو پێدڤییە ژ گومانێ ڤە دەست پێ بکەین نەك ژ پێخەمەت گومانێ بەلکو وەك شێوازەك بۆ ڕەخنەگرتنێ ژوێ زانیاریێ کو یا هەی و گەریان بۆ زانیاریەکا مسۆگەر تر ئەڤ گومانە ب (گومانا بەرنامەیی) هاتە ناڤکرن گومان د ڤێرەدا شێوازەکە ئەزموونکرنا شیان و هێزێن ڤەدەر ژ سادەیا مە، بەرنامەکە بۆ گەهشتنا مسۆگەریێ.

(دیکارت)ی وەسا تێبینی کربوو کو چەند بازنێن گومانان بکێشیت، ئەوا دمینیت گومان پێ ناهێتە کرن وەکی:

أ- تەنەکێ بازنەیی ڕووبەرەکێ تەختانە سنوور ددەت.

ب- دوو هێلێن ڕاست نەشێن جهەکی دوور پێچ بکەن.

ج- گشت مەزنترە ژ پشکێ.

د- ئەز بهێم و گومانێ بکەم هەبوون هەر تشتەکێ کو هەی، تشتەك دێ مینیت کو جهێ گومانێ بیت ئەو ژی (گومانا) من بخۆیە ئانکو دوێ تشتەکێ هەی ب کریارا گومانی ڕادبیت. ژ وێ تشتەکێ هەی کو هزردکەت د ڤێرەدا هزرکاری یا هەی یان ئەوێ هزردکەت ئانکو (ئەز هزردکەم ئەڤجا ئەز هەمە) دیکارتی لایەنێن گشتی یێن بەرنامێ ڕاستیێ ل پەرتووکا خۆ ب ناڤێ (ڕاپۆرتەك ل سەر بەرنامە) (مقالة في المنهج) ئاشکرا دکەت ئەڤ بەرنامە ژی ل دویڤ ئەڤان چەند بنەمایانە:

١- گۆمان ٢- شرۆڤەکرن ٣- ئالۆزی ٤- پێداچوون ٥- بەرهەڤکرن.

## دوو : ڕیباوەرا ئەزمونکاری :

ئەڤ ڕیباوەرە پشت ب ئەزمووونان گرێدەت و ئەزمووونا هەستی ب بنەمایێ زانیاریان ددانیت و ئەوێ بۆمە دەردئێخیت کا چاوا ئەزمووون مە دگەهینتە زانیاریێ وچاوا بەرنامەی پەیرە دکەین سەبارەت خەملاندنا ئاستەنگێن سەر ڕێکا مە وچاوانیا چارەسەرکرنا گیروگرفتان. ئەڤ ڕێباوەرە ئەوێ دسەلمینیت کو هەمی زانیارییێن مە ژ ئەزمووونان دەرئەنجام دبن ژوێ دەست پێ دهێتە کرن ئەڤەژی ئەوێ دگەهینیت کو ئەزمووون ژێدەرێ زانستی یە و هەر بیروباوەرەك و زانیاریەك ب ئەزمووونان دەربازنابیت ئەڤجا پێدڤیە ڤەگەرینە ڤە بەر ئەزمووونان ئەگەر نە چ ڕاستی یەك بۆ نینە.

ئەزمووونکار باوەر ژ چ زانیارییەکا خورست و ڤەشارتی دوو ژ ئەزمووونێ ناکەن ب ڤێ چەندێ ژی هەڤ دژن دگەل ڕێباوەرێن ژیری فەیلەسوفێن ئەڤێ ڕێبازێ تێبینی و دەرئەنجامێن ڕێبازانە و فیزیایا (نیوتن)ی ب نموونەکا باش یا فەلسەفا خۆ دزانن.

### فرەنسیس بیکۆن :

ئێکەم فەیلەسۆفێ کۆبیە ئەرکێ دامەزراندنا بەرنامەکێ زانستی یێ نۆی بخۆڤەگرت ناڤێ پەرتووکا وی (ئۆرگا نۆنانۆی) یان (ئەو ئامرازێ نۆی) کو ئەڤێ ڕامانێ ددەت ئەڤ ڕامانە نەیاریە ب مەرەمێن خۆ سەبارەت تێگەهشتنا گەڤنا زانستی کو پشت ب (ئۆرگانون)ێ ئەرستۆی گرێدابوو. بەری بهێنەکێ مە بەحسێ هندێ کر کو هەر ئێك ژ (بیکۆن و دیکارت)ی وەسا د زانستی گەهشتبوون کو سەپاندنا زاڵیا مرۆڤی ب سەر سروشتی و دەولەمەندکرنا ژیانا مرۆڤی ژییە بەلێ ئەڤە ب زانینا ڕێکێن ڕاستیا پشتی دیاردێن سروشتی نەبیت ناهێتە گۆڕێ بەلێ د کریارا زانیاریدا شاشی ڕووی ددەن ژ ئەنجامێ پشت گرێدان ب بۆچوونا ژیری ژ ئەنجامی

دەرئینان و دەرئێخستنا ڕاستیێ وەك تاكە ڕێكا زانیارییە ئانكو پشت گرێدانا ئەرستوی و (خواندنگەهێن وی) ب پیڤانێ كو ژ هەڵسەنگاندنێ پێكهاتیە وئەڤەژی ب ڕۆلێ خۆ ژ تێگەهان پێكهاتیە. تێگەهێن وێ ژی ب ڕێكا بژاندنێ لەزلێكریە و پێك دئینین ژبەر ئەڤێ مەرجێ ئێكێ یێ باش كرنا زانستی و پێشكەفتنا زانیاریا مرۆڤایەتیێ، باشكرنا ڕێبازێن بژاندنێ و بژارەكرنا تێگەهان ژبەر هندێ كریارا بژاندنێ كریارەكا یاسا دەرئێنانێ یە. بنەمایێ هزركرنێ بۆ باشكرنا زانستی دانانا بیردۆزەكا نۆی بوو. بۆ یاسا دەرئینانێ فەیلەسۆفێن بەری (بیكۆن)ی گرنگیا خۆ د یاسا دەرئینانێ ئاراستێ ئەوان بارێن داكەفتی دكر كو ڕاستی ئەڤ یان ئەو مەگرتیێن سەرتا سەری دەرئێخستن بۆ بژاندنا وان.

هندی (بیكۆن) بوویە پویتە ب داكەفتیان دایە كو ئەو بژاندن پیچ دكرن و نە د ڕێك وپێك بوون (بیكۆن) ئەو ب (نموونا نەرێنی) ناڤ برن و بشێوەكییە كو داكەفتیێن وان گشت یان ب لایێ كێم ڤە پشكەكا بژاندنێ یە لەزالێ هاتیە كرن وپیچ دكەت بۆ چوونا بێلونی وەسایە گوه نەدان ب ژێدەرێن نەرێنی ئەگەرەكێ سەرەكیێ هەمی هەڵسەنگاندن و بوچوونێن شاشی بوویە.

بەلێ مەرجێ دووێ یێ باشكرنا زانستێ پاقژكرنا ژیریە ژ خەون و خەیالان (الاوهام) بیكۆنی چوار جۆرێن خەون و خەیالان یان بەربەستان جودا دكەت كو دهێنە ڕێیا زانیاریا ڕاست و ب (پتێن ژیری) (الاصنام العقلية) ناڤ دكەت كو ئەڤەنە:

١- خەون وخەیالێن هۆزێ (القبلي).

٢- خەون و خەیالێن شكەفتێ.

٣- خەون و خەیالێن بازاری.

٤- خەون و خەیالێن شانۆیێ.

## سیٚ: ڕێباوەرا ڕەخنەگری:

ئەڤ ڕێباوەرە مفایێ سەرجەمێ گەشەپێدان و وەرارا هەڤبەریێ ناڤبەرا فەلسەفا هەردو ڕێباوەرێن (ژیری) و (ئەزموونکاری) ئەڤ هەوە ژی فەیلەسۆف (عەمانۆئێل کانت) پێ ڕابوویە گەهشتە هندێ کو ژیر و ئەزموون بۆ تەماميا زانیاریێ گرنگن وەسا هزر دکر کو ئەزموونکاریا بێ ژیری کوراتیەکا بێ ئەنجامە هەروەسا ژیری بێ ئەزموون یێ پیچ و بێ ناڤەڕۆکە فەلسەفا (کانت) ب ڕەخنەگریێ هاتە ناڤکرن چونکی ڕەخنە ل شیانداریا زانیاریا مرۆڤایەتیێ دکر ب هندێ کو یا سنووردارە.

(کانت) دبێژیتن ژیر ب سنوورێ خۆڤە یێ سنووردارە ل بەردەم بابەتێن میتافیزیکیێن مەزن کو پەیوەندی ب خودێ وجیهانێ و دەروونی ڤە هەیە هەڤسەنگی دیارکریە.

## دوو: فەلسەفا ڕۆژئاڤایا هەڤچەرخ:

### ١- دبیتن د پەرتووکێن دیرۆکی دا کارتێکرنێن پێکئینانا فەلسەفا ژیانا هەوە سەبارەت ب سەدێ (١٩ - ٢٠) تە خواند بیت وییێ دخوینی مەرەما من ئەڤەنە:

أ- ئەنجامێن شۆڕەشا فرەنسا و شەڕێن ناپلیۆنی ل سەدێ (١٨ - ١٩) و کاریگەریا وان ل سەر لایەنێن هزر و سیاسەت و جڤاکی.

ب- سەرهدانا شۆڕەشا پیشەسازی ل دووماهیا سەدێ (١٨) و دەسپێکا سەدێ (٢٠) و ئەنجامێن ئەڤێ سەرهلدانێ بارێ ئابووری و جڤاکی و ڕەوشتی و ئەنجامێن ئەوێ یێن خراب ب سەر جڤاك و تەبەسەرکرنا کرێکاران وخوارنا زەحمەتا وان د دەولەتێن پیشەسازی دا زێدەباری سەرهلدانا بزاڤا داگیرکەران ل دەولەتێن

سەرمایە داری و تالانکرنا سامان وکەرستێن خاڤێن دەولەتێن هاتینە داگیرکرن ب تیۆرێ کو فرەنسیان ئینایە گۆرێ دبێژیت (رێکی بدێ باربکەت) و رێکێ بدە بلا دەربازبیت پشتی ئەوێ ژی زانایێ ئابووری (ئادەم سمیث) ئەڤ بیردۆزە دووبارە کریە.

ج- پێنگاڤێن بەرفرەهێن پێشکەفتنا هەمی زانیاریان ئێك ل دویڤ ئێك چ ل بارێ بیرکاری و فیزیا و کیمیا و زیندەوەرزانی.

د- دەستنیشان نەکرنا نەخشێ سیاسی یێ ئەورۆپا هەتا دەسپێکا سەدێ بیستێ و پشتی هەردو جەنگێن جیهانییێن ئێکێ و دووێ.

ه- ئەنجامێن خرابێن هزر و دەروونی یێن هەردوو جەنگان ب سەر خەلکی دا و هەڤرکیا ئایدۆلۆژی ناڤبەرا هەردو لایێن رۆژهەلات و رۆژئاڤای هەڤرك و ناتەبا بوون.

**٢- ئاراستێن هزرو فەلسەفا سەدێ نۆزدێ ب کورتی ب ڤی شێوەی بۆیینە.**

عەمانوئێل کانت وەغەر کر و فەلسەفا وی ب خالەکا گوهۆرینێ د دیرۆکا وان ب سەر دیرۆکا فەلسەفێ هاتە هژمارتن هەروەکی (ئەفلاتۆن و ئەرستۆ) وکارتێکرنا وان ب سەر دیرۆکا فەلسەفا یونانی، گرنگترین ئەنجامێن فەلسەفا (کانت) سەرهلدانا پێلەکێ بوو ب ناڤێ (نموونەیی) (هیگل) دەست پێکر ووەسا هزر دکر کوژیرێ مرۆڤی دشێت ل راستییێ بگەهیت ودروست بکەت وهەردەم سنووردار نینە دشێت ل رێکا هەر هزرەکێ وهەڤ دژێ وێ هزرەکا نوی پێك بینیت ئەڤەژی پشکان لێکددەتەڤە دگوت: ئەڤ بۆ چوونە ژی ب سەر هەمی لایێن راستییێ بتنێ دیرۆکێ ژی دا سەپاند ب رێکا کاریگەریا فەلسەفا (عەمانۆیل) و (هیگل) وفەیلەسۆفێن ئەلمانی ژی بزاڤەکا دی یا رومانسی ژ وێژە و هونەری پەیدا بوو.

رێباوەرا نموونـەیی بـەرەڤ ئینگلترا و فرەنسا و ئیتالیا چوو و (هـەڤبـەریـەکا

ماددی) بوویە و ئەڤە پشتی ماددێن یاسایێن بەری گیانی دزانی و ب وێ هەر تشتەك یێ گرێدایە ب کەرستە و یاسایێن وێ هەتا جڤاك و دیرۆك وویژە ژی هەروەسان، (مارکس) کو دانەرێ ئەڤێ فەلسەفێ یە، دیرۆك ب سەر هەڤڕکیا تەخاتییێ ناڤ جڤاکی دناساندو فەلسەفا وی دەمەکێ دوور و درێژ یا کاریگەر بوو هندەك دەولەتان پەیڕەو دکر:

د هەمان دەم دا تەڤگەرا سوشیالیستی ل فڕەنسا و ئینگلترا و ئەڵمانیا پەیدابوو و فەیلەسۆفێن وێ موژیلی چارەسەکرنا ئاریشێن جڤاکی ل ئەورۆپا و ڕۆژئاڤا کربوون دوێ قوناغێ دا. ئەڤان نێرینەکا گشتی سەبارەت ڕاستیێ و جڤاك و ڕۆلێ مرۆڤی و زانا و فەیلەسۆفان بۆ چارەسەرکرنا بارێ کۆمەڵایەتی دەستنیشانکر.

سوشیالیستان پێکول دکر کو بۆچوونێن خۆ ب ڕێکا دامەزراندنا جڤاك و گوند کو ئاڤا کر و چاوانیا رێکخستنا وان بجهبینیت، دفڕەنسادا تەڤگەرەکا دی ب ناڤێ (بارەکی) سەرهلدا و فەیلەسوفێ فڕەنسی (ئوگست کۆمت) دەست پێکر و پشت ب ژینگەهێ بۆ دەرئێخستنا ڕاستیان و تێبینی کرنا وان گرێدابوو بهندێ کو پێدڤیە یاسایێن ژینگەهێ ب رێکا ئەزموونان بهێنە دیارکرن وەسا دهێتە دیتن کو فەلسەفا (بارەکی) تاکە ڕێکە بۆ ڕزگارکرنا جڤاکی. (کۆمت) دەرباری زانیاریا جڤاکی ڤە ناڤ و دەنگێن خۆ دەرئێخستبوون دڤیا یاسایەکا بنەجە بۆ گوهۆڕینا جڤاکی و گەشەپێدانا وی ڤەبینیت گرنگە دڤێرەدا ئاماژە بۆ بیردۆزا گەشەپێدانێ زانا (چارلز داروین) کو سەبارەت ب چاوانیا زیندەوەران بکەین ژبەر کو ئەڤێ کارەکێ مەزن کرە سەر هزر و فەلسەفە و بیردۆزان ب هەرسێ شێوان هزر و باوەرێن سیاسی ب ڤی جۆری لێکددەن:

أ- هزرکرنا هەڤڕکیێ ژ پێخەمەت مانێ کو ژبەر کێمیا دەرامـەتی و گەلەك پێدڤی،

زیندەوەر دکەڤنە هەڤڕکییێ هەتا کومانێ بۆ خۆ وبۆ نەڤیێن خۆ دابین بکەن.

ب- هزرکرنا هەلبژارتنا سروشتی بهندێ ئەوێ ب شیان وبهێز دشییێت دسروشتی دا بمینیت وئەوێ لاوازو بێ هێز ژناڤ دچیت.

ج- هزرکرنا مانێ بۆ هەمیا باشتر . . . ئانکو ب ڕێکا هەڤڕکیا ناڤبەرا زیندەوەران کو دگەل زیندەوەرێن دی و ڕاوەستان ل ڕوویێ سروشتی (داروین) دبێژیت شێوێ نهۆ یێ زیندەوەران ئەنجامێ چەند گوهۆڕینەکێن شێوەی پشتی هەڤڕکییێ دگەل سروشتی و دەوروبەرێ وی دا.

ئەو هزروبیرێن گرێدان ب فەلسەفێ و ڕەوشتی و ئایینی هەبوویە، ئەڤە بوو هندەك ژ فەیلەسۆف و هزرکاران تێگەهێ گەشە پێدانێ ب سەر دیرۆك وجڤاك ومرۆڤی دا بجهئینان، هندەك ژوان وەسا هزر دکر کو هێز و هەڤرکی جەوهەرێ ڕاستی دەردبڕن بەلێ ژ لایێ هندەك ژ فەیلەسۆف و پیاوێن ئایینی و فەیلەسۆفێن ڕەوشتی ڕەخنەکا دژوار دژی تێگەهێ گەشەپێدانێ و ئارمانجا فەلسەفی و ئاراستێ وێ ویێن دی دهێنە ئاراستەکرن.

ئەڤجا پێدڤیە ل سەر مە بەری ئەوێ داویێ ب بەرچاڤکرنا ڤان هزرو بیرێن کاریگەرێن سەدێ نۆزدێ بینین ئاماژێ بۆ ڤەکۆلینێن دەرونییێن مرۆڤایەتییێ بکەین کو گرنگی یەکا کارێگەرا مەزن کریە و نوژدار و دەروناس پێڤە ڕابوون وەکی (سیگمۆند فرویدکارل یونخ) وکەسانێن دی ل هەولدانا تێگەهشتنا دەروونێ مرۆڤی و دەرئێخستنا ڕەفتارا مرۆڤی و پاڵدەرێ وی، ئەڤان ڤەکۆلینا ژی کارکرە سەر چەند لایێن هزر و فەلسەفێ و وێژە. ئەڤجا ب وی شێوەی شرۆڤەکرنا دەروونی

بوو بابەتەکێ دی د دئێخیتە دگەل بابەتێن دی بۆ تێگەهشتنا ڕاستیا مرۆڤایەتیێ.

### ٣- فەلسەفا هەڤچەرخا سەدێ بیستێ:

سەبارەت زانستی د سەدێ بیستێ دا هەمی زانیاریێن بەری وی سەبارەت پێنگاڤێن بەرفرەه بەرەڤ پێشڤە هاڤێتن دەربارەی بیرکاری و کیمیا و فیزیا و زیندەوەرزانی و دەروون زانیا جڤاکی و ڕەخنەگری و وێژەی بیت.

ئەڤان ڤێکرا کارکرە سەر بیرسا و تیۆرێن زانیاری و میتافیزیکێ و ڕەوشتی لەوڕا ژی د وی سەردەمی دا گرنگی ب سروشتێ مرۆڤی و ڕاستییا هەڤبەندیا وی ب دەوروبەرێن خۆ بەرپرسایەتیا بەرامبەر وی بخۆ و جڤاکی ئەوا هاتیە پێ دان چەند ئەنجامەك هاتنە بەردەست وەکی هەبوونەکێ کو دڤیا رامانا هەبوونا مرۆڤی وئەرکێ سەر ملێ وی دەرهەقێ ڕەوشتی دەستنیشان بکەت.

ل ڕۆژهەلاتێ ژی پشتی داویا شەرێ جیهانی یێ ئێکێ و ڤەکێشانا دەستهەلاتا عوسمانی ل سەر وێ پشکێ وشارستانیەتا وێ ئەوا ئاسۆیێ شارستانیەتەکا دێرێن پاشەڕۆژەکا پڕشنگدار وەك پشکەك ژ ئاڤاهیا شارستانیەتا مرۆڤایەتیێ کو ژیێ وێ بۆ ٦٠٠ سالان دچوو ئانکو ل سەدێ حەفتێ هەتا سەدێ سێزدێ زایینی.

هندەك ژ هەلمەتیێن ڕۆژهەلاتی مەرەم ژێ گەهشتن بوو بۆ ڕۆژئاڤای. ناساندنا وێ شارستانیەتێ ژ لایەکێ دیڤە پویتە ب ناسنا مە و کەلەپۆرێ دەڤەرێ دا.

د ڕۆژئاڤای دا فەلسەفێ ب هەمی لقێن خۆڤە وەرارکر و چەند خواندگەهێن ژیری وئەزموونکاری هاتنە گۆڕێ سەبارەت زانیاریێن سروشتی ڤە ئەنشتاین و چەند زانایێن دیێن فیزیایێ ڕۆلەکێ مەزن د گەشەپێدانێ دا هەبوویە ب وێنەیەکێ

دی ئەوان جیهانەکا جودا ژ شێوەزارێ کو ل سەردەمەێ نیوتنی بەلاڤ بووی پەیداکر.

شرۆڤەکرنا ڕاستی و ئاخافتنیێن فەلسەفی و دەستنیشانکرنا ڕامانا سروشتکاری هەر ئێك ژوان دڤی چەرخی دا تایبەتمەندی هەبوویە وهندەك جاران ئەڤ شرۆڤەکرنە ژی یان زاراڤە بووینە یان بخۆ ژی بشێوەکێ لۆژیکی یان فەلسەفی، فەیلەسۆفان وەسا دیت کو شرۆڤەکرنا بەرنامێ گرنگێ فەلسەفێ یە و پڕانیا ئاریشێن فەلسەفی دەمێ دەستنیشانکرنا ڕامان و بابەتێن دی دهێتە چارەسەرکرن و پەردە ب هویری ل سەر لایێن شاش و ڤەشارتییێن ئاخفتنیێن فەلسەفی هەلددەت.

ئەڤ ڕێبازا مەزن فەیلەسوفێن وەکی (براتراند ڕسل) و چەندێن دی وان پەسەند دکر.

ڤەکۆلینان چەندێن شێوێن هویر و شێواز بخۆڤە دیتن وزانیاریەك ب ناڤێ (سیمیوتیقا) هاتە دامەزراندن ل سەرەدەریا مرۆڤی دەمێ مامەلەکرنێ دا دگەل خەلکی ڤەدکۆلیت و ڕوناهی دئێخستە سەر زمانی و ئاماژە ژی بۆ نیشانێن سەر ڕێ و ڕێبارێن هاتن و چوونێ و هەروەسا زمانێ مۆزیکی و زمانێ زانیاریێ ویێن دی دکر.

ڤەکۆلینەك د دەستپێکا شێستاندا ناڤێ شێوەیان گرنگی ب ڤی جۆرێ زانیاریاندا . . . بۆ نموونە دبێژیت شێوێ زمانێ شێوێ گشتیێ هەمی زمانانە.

شێوێ کۆمەلایەتی شێوێ هەمی کۆمەلایەتیانە (شێوە) دیسان گرنگی ب وێژە و ڕەخنەیا وێژەییدا خواندنگەها ناڤبری ب (پراگماتی) گەلەك داخبارێ ئەڤێ فەلسەفێ بوویە و دگوت: پێدڤی یە پیڤەرەك بۆ ئەوان ڕاستیان دابنین کو ب وێ ڤە

وەرگێرانا زانیارییێن فەلسەفیێ دهاتنە وەرگێران ئەڤێ خواندنگەهێ وەسا دیارکر کو ڕاستیا هەر هزرەکێ پێدڤی یە ل دویف پێنگاڤێن زانیاریێ بهێتە پیڤان. بۆ نموونە ئەگەر مە گوت پەیکەرێ شەهیدی (نصب الشهید) هونەرکاریەکا باشە، فەلسەفا پراگماتی ئەڤێ ئاخفتنێ ب ڤی جۆری لێك ددەت.

أ- ئەڤ کارە یان پەیکەرە سەرنجامە ڕادکێشیت و درێژییێ ب تەماشەکرنێ ددەین.

ب- ئەڤ پەیکەرە شێوێ هونەرێ وی یێ نایابە پێدڤی یە ب هویری بەحس بکەین.

ج- ئەو کەرەستێن خاڤ کو وی هونەرمەندی ب کارئینانینە پەیکەرێ وی جوان کریە.

د- ڕامانێن ئەڤی کاری دکویرو گرنگن.

ئەڤجا ب ڤی ڕەنگی ئاخفتنێن مە یێن ڕووت بۆ چەندپێنگاڤەکا شرۆڤەکریە و هەتا ل وەرگرتنا وێ نێزیك بین ودگەهین ب بەروڤاژی خو ل بەردەم هزرەکا ڤەشارتی وبێ ڕامان وبێ نرخ دبینین . . . هندەك ژڤان دڤیا ئەڤان هزر و باوەریان ل بیاڤێ پەروەردێ و فەلسەفێ وزانیاریێ ب کاربینین . . . . ئەڤێ ڕێبازێ گوهۆڕین ب سەر هات هەتا ئەوی ڕادەی کو ل بەرژەوەندیا خۆ زێدەتر بەرچاڤ نەدکر هندەك ژ فەیلەسۆڤان دگوت بڤێ هزرێ دەروونێ سەرمایەداران دهاتە بەرچاڤ کرن.

د وێرێ دا دیاردەکا دی ب ناڤەکێ دی ب ناڤێ (دوورهێل) (واقعیة) بەرامبەر ب دیاردا نموونەی پەیدابوو وەك کارڤەدانەك سەبارەت ب کارتێکرنا فەلسەفا (هیگل)ی. ئەڤ دیاردەیە هەبوونا جیهانا دەرڤە دسەلمینیت ودبێژیت هزر وهۆش و خۆیەتی پلا ئێکێ نەبوویە ل زانیاریێ لەوڕا هەر تشتەك ڤیابایە لێ تێبگەهن دێ ل دویف ژینگەهـ و دوو ژ شرۆڤەکرنێن نموونەیی و گیانی دێ ئەوان لێك ددەن

فەیلەسۆفێن ئەڤێ ڕێباوەرێ کو ب فەلسەفا دوورهێلی (واقعی) ناڤکر. هندەك ژ فەیلەسوفان ژی ب توندی ئەوان ڕەخنە سەبارەت ب تایبەتمەندیێ و رووتایەتی دشرۆڤەکرنا فەلسەفێ دادگرت ودگوت پێدڤیە فەیلەسۆف ب رێکا دیاردێن مرۆڤایەتی و کومەلایەتی مامێ دگەل هزرێ دا بکەت و نابیت پشتێ ب شێوێن رووت بگرێددەت بەلکۆ پێدڤیە ئەوێ ئاریشێ ب ڕێکا وان ئەرکێن جۆرا و جۆرێن کو مرۆڤ دناڤ جڤاکێ خۆدا ئەنجام ددەت یان چالاکیێن سەبارەت ب زانست و ئایین و سیاسەت و فەلسەفێ چارەسەربکەت ئەڤەژی هەمی پێکڤە گرێداینە.

دیسان کو ڤەکۆلینەکا دی دشیاندایە ناڤێ ئەنترۆپۆلۆجی (علم النفس) لێ بدانین سەرهلدا ئەڤ فەلسەفە ب سەرەدەریا مرۆڤی وچالاکیێن وی دناڤ جڤاکی دالێك دایە، دیسان دهەمان سەدەدا فەلسەفا هەبوونێ (الوجود) و فەلسەفا دیاردەیی پەیدابوون.

د داویێ دا ئاماژە ب گرنگترین گوهۆڕینێن دیرۆکا فەلسەفێ دکەین پشتی ل سالێن شێستان ئەو ژی بخۆ ل فەلسەفا ژینگەهێ دیاردکەت و ئەڤێ فەلسەفێ ئەو دپێ نەخۆش بوون ب ئەگەرێ پیس کرنا ژینگەهێ ژ لایێ ڕۆژئاڤاییان ب هندێ کو تەکنەلۆژیا نوی ب باشی ب کار نائینین و زەرەر و زیانێ ل خۆ و زێندەورێن دەوروبەرێن خۆ ددەن و سروشتی تێك ددەن. فەیلەسۆفێن ژینگەهێ نێرینا وان فەلسەفا ڕۆژئاڤا ب تێکدانا ژینگەهێ تاوان باردکرن ب هندێ کو مرۆڤێ ڕۆژ ئاڤا خۆ ل ڕێزا پێشیێ ددانن و بەرژەوەندیا خۆ دئێخنە سەر هەمی تشتەکی دشیێن بێژین فەلسەفە د سەدێ بیستێ دا گەشە کر و دێ بینین مامله دگەل لایەنێن دژوارێن سەر ڕێکا مرۆڤێ سەدێ بیستێ دکەت دوی دەمی دا هند نەمابوو بچیتە ناڤ سەدێ بیست و ئێکێ.

## پرسیارێن پشكا شەشێ

پ ١/چاوا هزرا فەلسەفا ئەوروپا یا نوی پەیدابوو، ئەگەرێن پەیدابوونا وێ ژی چنە؟

پ ٢/ سەبارەت (دیكارت) و (بیكۆن) چ دزانی؟ بتنێ بەحسێ ئێك ژ وان بكە.

پ ٣/ گرنگترین رێبازێن فەلسەفا نوی چنە؟ بژمێرە ل سەر ئێك ژ وان باخڤە.

پ ٤/ مەرەم ژ: أ- رێباوەرێ ژیری ب- رێباوەرا ئەزموونكاری ج- فەلسەفا رەخنەگری چییە؟ ئێك ژ وان هەلبژێرە ب كورتی بەحسێ وێ بكە.

پ ٥/ ڤەدیتێن زانستی چ كارەكی دكەنە سەر فەلسەفێ و ئاراستێن وێ.

پ ٦/ جوداهی دناڤبەرا فەلسەفا نموونەی و فەلسەفا ماددی ودیروكی دا چیە؟

پ ٧/ گرنگترین تەڤگەرێن فەلسەفا ئەوروپی ل سەدی بیستێ چنە؟

پ ٨/ سروشتێ هزرا رۆژهەلاتێ ل سەر دەمێ ڤەژاندنێ و رۆژانێن مە یێن ئەڤرۆ چییە.

# ناڤەرۆك